


**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە**

**بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر**

ناوی کتێب: خدری زندە

ئامادەکردنی: مەجید عەبدلرەحمان

نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆك: عوسمان پیرداود

چاپی یەکەم – چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر/٢٠١١

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٨٢٥) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە

# بەرایی

خالید جووتیار

حیکایەت یان چیرۆک. یان گێڕانەوە لە دنیای ئەدەبی فۆلکۆری کوردیدا شوێنێکی دیارو شیاوی هەیە بیرو لێکدانەوەی والآ کردۆتەوە، سەربەری تاقیکردنەوەو، لە دنیا گەیشتن و شۆڕبوونەوە بۆ ئەو شوێنە بزرانەی کە نەستی مرۆڤ و کاری جوان شیرازە دەکەنەوە. ئەو گەڕان و شون هەڵگرتنەی حەکایەتان بۆ چەندان مەبەست بووە، لەوانە: زمان، ئامۆژگاری، لە قەدەغەدوان، نزیک بوونەوە لە ئاقیدەی ڕابردوو، کە رۆژگارێک بیری سەردەمیان بووە، هەر حەکایەتێک بەچەند قۆناغ و زەمانێک دارەت بووە تا گەیشتوتە ئێمە. ئەمرۆکە بە تۆمارکراوی دەیانخوێنینەوە.

بێ گومان گەلێ ئادگاری خۆی لەدەست داوە، پێشان کەسەردەمی زێڕینی حەکایەتان بوو حەکایەتخوان هەبوو هەموو ژیانی خۆی بۆ ئەو ژانرەتەرخان کردبوو، کەواتە بیرکردونەوەو رامان و بینایی خۆی بۆ ئەو مەبەستە دانا بوو، هەولی دەدا جوانترین و سەرنج راکێشترین کەرستەی گێڕانەوەی هەبێ تابەرهەمێکی نوێ بدا بەدەستەوە، لە حەکایەتی کوردەواری مۆتیڤەی دووبارە بوونەوە زۆرە کە پێکهاتەی حەکایەتەکانی هەندێک لاواز کردووە بەوبارە بێ دەسەڵاتی حەکایەتخوان نیشان دەدات چونکە نەیتوانیوە مۆتیڤەی تازە دروست بکات و گرێی حەکایەتان چالاکتر بکات بۆ گوتن و گێڕانەوەی کاریگەرتر.

سەرەتای حەکایەتان بە (هەبوو، نەبوو) دەست پێ دەکات ئەوەیان هونەری بە نازدمەن کردن و بێ شوێن کرانە لە حەکایەتان. یان زەمەنێکی ئایندەی بەردەوامە دەگونجێ وابێ، بەم شێوەیە گومان لەسەر گێڕانەوەکە لادەبات، ئەوە خالێ سەرەکی و بەهێزی حەکایەتەکانە. هەموو حەکایەتی کوردی ئەگەر پەیڕەوی - مۆرفۆلۆژی - (فلادیمیر بروب) بەراورد بکەین بێگومان لەو (٣١)

خاڵە ڕەت ناکەن، ئەوە شێوەی هەموو حەکایەتی دونیایە، ئەو حەکایەتانەی ناو ئەو کتێبەش بەدەرنین لەو خاڵانەی باسمان کرد. دەکرێ لە خوێندنەوەیاندا چەند سەرەداوێکی عەقلی بەرایی کورد دەست نیشان بکەین کە باس لە کەسی ئاگر پەرست دەکات یان پەیوەندی چیرۆکی یوسف و خستنە ناو بیری براو هەندێ دیمەنی تری ناو تەورات و قورئان. گێڕانەوە بە زۆری و کالی نییە لێکۆلەر لە هەموو حەکایەتێک لە چەند رستەیەک دەگەڕێ، ئەو رستانە گورز وەشاندنەکەیە لەمەبەستی دیاریکراو، کە هەمیشە مرۆڤ سەودای نهێنی سێکس و مەرگ و نەمری بوو لە حەکایەتی (شازاوە شێرۆ)دا، کەیەکێکە لە حەکایەتە درێژەکانی ئەم کتێبە چەندان تێبینی و سەرنجی ورد هەڵدەگرێ، تێکەڵەیەکە لەبیرکردنەوەی بەرایی کوردو ئاقیدەو بازرگانیو سەفەرو هێماکانی مەرگ و پەیوەندی بە حەکایەتە پیرۆزەکانی ناو ئینجیل و تەورات و قورئان کەسەر بردەی (مریەم و یوسف و ئیسماعیل...) دەگێڕنەوە بەڵام بەگێڕانەوەیەکی کوردانە. لە (چل کەزی) دا حەکایە تخوان دەگەرێتەوە سەر نهێنی ژمارە - چل - کە لە دیدو ئاقیدەی کۆنی گەلانی رۆژهەڵات بە تایبەتیش کورد شوێنێکی پیرۆزی هەیە، لەبەرئەوەی جەنگی پیرۆزی دژی هۆکارە دەرەکیەکان نیشان دەدا بە دووبارە کردنەوەی مۆتیڤەی حەکایەتی تر.

لەو بەراییە کورتە ناکرێ هەموو هێماو ئاماژەکانی ئەو حەکایەتانە شی بکەینەوە، ئەوە لێکولینەوەیەکی سەر بە خۆی دەوێ. خاڵێکی گرنگ هەیە دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەویش شێوەزاری نوسینی حەکایەتەکانی، کە دەبوا کۆ کەرەوە، کە خۆی خەڵکی شەقلاوەیەو خۆشناوە بە شێوەزاری ناسک و جوانی ئەو ناوچەیەی تۆمار بکردبا، وا لای من کاریگەری جوانتر دەبوو...دەست خۆش

# دەستپێک

زۆربەی زۆری زاناو ڕۆژهەڵات ناسانی وەکو (مار، باسل نیکتین، مینورسکی، سیمنوف، لاسکۆ، ئەبۆفیان).

هەتا نووسەری گەورەی کورد (عەرەب شەمۆ) ئەمانەیان بە وەسیلەیەک داناوە بۆ گەیشتن بەڕاستی بیرو باوەڕی کورد لە کۆن و نوێ، وە گەیشتن بەو ئایینەی دەیان پەرست - ئەوانە هەڵساون بەزانیاری وەرگرتن لە وێنەی (عفریت، جن، ڕۆژ، مانگ، بەرد، دار)و هەندێک ئاژەڵ بەتایبەتی وێنەی (مار یان، عەزیا) کە لە زۆربەی ئەفسانە یان هەقایەتە درێژەکانی کوردەواری هەیە.

ئەفسانە بە کۆنترین جۆری فۆلکلۆر دادەنرێ لەبەر ئەوەی وێنەی ئەوکات و سات پیشان دەدات کە مرۆڤ دەستە وەستان وەستاوە بەرامبەر سروشت نەیتوانیوە تەفسیری ڕووداوەکان بکات، لە ڕووداوی سروشت و دەوروبەری کە لەسەروی توانای خۆی دا بووەو نەیتوانیوە دەستی بەسەردا بگرێ. ئەفسانە هەولی سەرەتایی مرۆڤە بۆ تێکەیشتن و ناسینی جیهان و دەوروبەری.

ئەگەر سەیری ئەفسانەی یۆنانی کۆن بکەین دەبینین بۆ هەر ڕوویەکی ژیان خوایەکی داناوە وەکو خوای خێرو شەڕو جوانی و بەفرو ئاوو سروشت و بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەفسانەی گەلانی تربە تایبەتی کورد دەبینین زۆر لەیەک نزیکن لەئەفسانەی کوردیش دەبینین کەمل ملانێو کێشە لە مابەینی ئینسان و دەوروبەری هەیە لە کۆتایشێ هەر مرۆڤ سەرکەوتووە بەسەر شەڕو زولم و زۆر داری و تاریکی - لە ئەفسانەی یۆنانی دەبینین کێشە لە مابەینی پاڵەوانی تراژیدیاو خواوەندەکانی یۆنان هەیە - ئەو وێنەیەی کە لە ئەفسانەی یۆنانی دەبینین لەگەڵ ئەفسانەی کوردی پێک دەچن چونکە دەبینین پاڵەوانی ئەفسانە لە هەردووکیان مرۆڤە، زۆر دەکەوێتە کێشەو مل ملانێ لەگەڵ جن و دێو، ئەوەی دەربازیان دەکات تەنها مرۆڤی چاک و پاکە.

لە ئەفسانەی کوردی ئەگەر سەیر بکەین لەو کێشەو مل ملانێیە هێزی خێر کە مرۆڤە دونیای داگیر کردووەو بێ ترس دەژێ لە ژێر تیشکی ڕۆژو لە ژێر

رۆناکی رۆژ لە بۆ خێرو خۆشیو خۆشەویستی کاردەکات، بەڵام هێزی شەڕوتاریکی کە ژمارەیان لە چاو هێزی خێر کەمە لە تاریکی و کونە ئەشکەوتەکان دەژین وە لە تیشکی رۆژو روناکی زۆر دەترسێن لەگەڵ هاتنە دەری تیشکی رۆژ ون دەبن، چونکە لە رۆژ دەترسن. لە ئەفسانەی کوردی هێزی شەڕ بەرەونەمان دەچێت چونکە تێکەڵ بەدیاردەکانی ئایین بووە، وەک لە هەقایەتە کوردییەکان باسی دێوو جن دەکات دەڵێن پاش هاتنی پێغەمبەر (محمد(د.خ)) لە پشت چیای قاف زنجیر کراون.

ئەو چیای قافە هەر ئەو چیای قەفقاسەیە کە لە ئەفسانەی یۆنانی دەیبینین و باسی کراوە کە لەو کات بە دوور ترین شوێنی جوگرافی لەسەر رووی زەوی دادەنرا. وێنەی مارو عەزیاکە لە ئەفسانەی کوردی هەیە ئەویش وێنەیەکی ترە لە هێزی شەڕکە زانایانی (میسۆلۆژیا) ئەوشتە بە باوەڕی ئاینە کۆنەکان دەبەستنەوە. هێزی خێریش لە شێوەی جیاجیا لە ئەفسانەو هەقایەتی کوردی دەردەکەوێ لە شێوەی پیاو چاک لە چۆل و بیابان دەگاتە ئەوانەی بە دوای مەرامێک دەگەڕێن یا رێگا ون دەکەن. لە ئەفسانەکان بە (خدری زیندە) ناوی دەبەن ئەفسانەی کوردی وا لەو پیرەمێردە نورانیە دەکات کەقەت نامرێو لە ناو ناچێ دژی هێزی شەڕ.

**مەجید عەبدولڕەحمان**
**شەقڵاوە**

هەبوو نەبوو چ لە خواو پێغەمبەری گەورەتر نەبوو چ لە شەیتانی مەلعونتر نەبوو چ لە درۆزنی ڕوو ڕەشتر نەبوو، پاشایەک هەبوو چل کوڕی هەبوو، دیوەخانێکی گەورەی هەبوو، ڕۆژێک دەروێشەک هاتە دیوەخانێ پاشای سەلامی کرد زۆر بە خێریان هێناو خزمەتیان کرد، دەروێش سەیری بەرو دیوەخان و کوڕەکانی پاشای کرد، گوتی: ماشەڵلا پاشام خۆشبی ئەوانە هەموویان کوڕی تۆن، پاشا گوتی: بەڵێ: مامە دەروێش گوتی: خواسە لامەتیان بکاو عەمریان درێژ بکاو بۆ تۆیان بهێڵێ، بەڵام زۆر حەیف و مخابن ئەو برایانە لە یەکتر جودابینەوە، خۆزگە هەر لەگەڵ یەکتریان و پشت و پەنای یەکتریان، کوڕی گەورەی پاشا گۆتی: مامە دەروێش قسەکەت مانای چییە؟ گۆتی: هیچ نیە، پاشاش گوتی کوڕم مانای هیچ نییە حەقت بەو قسانەدا نەبی. کوڕی گەورە گۆتی دەبێ مەرامت بڵێی مام دەروێش. بابیشی گۆتی: مامە دەروێش پێیان بڵێ مانای چییە؟ مام دەروێش گۆتی: پاشام خۆش بێ ئەوان چل بران ئەگەر چل خوشکیان بۆ بخوازی ئەوە هەردەم برای یەکتر دەبن پاشا گۆتی: مامە دەروێش کێ هەیە چل کچی هەبێ تا بەیەکجار بۆیان بخوازم؟ مامە دەروێش گۆتی: پاشام خۆش بی پاشای ولاتی مەغریب زەمینێ چل کیژی هەیە ئەگەر ئەو چل کچەیان بۆ بینی ئەوە ئەو برایانە ژنیان دەبنە خوشک قەت لێک جودانابەوە.

دەروێش پاداشتی خۆی وەرگرت و ڕۆیشت، چەند ڕۆژەک بەسەردا ڕۆیشت کوڕی گەورە گۆتی: بابە ژنمان دەوێ، پاشا گوتی: باشە کوڕم ئەوساڵ بۆ تۆ ژن دەینم ساڵەکی تر بۆیەکی تر تاچل تەواو دەبن بامن پاشاش بم چل بووک پێکەوە بەمن نایێ، کوڕی گەورە گوتی: بابە نابی هەر چل ژنمان پێکەوە دەوێ، هەرچەندە بابی داوای لێکردن گۆتیان: بابە ئیزنمان بدە ئێمە دەڕۆین ئەو چل ژنەی مام دەروێش گۆتی لە مەغریب زەمینێ لۆ خۆمان دەینین هەرچەندە بابی گۆتی: کوڕم ناکرێ، فایدەی نەبوو چل ولاخیان لە تەویلەی دەرهێناوهەر

یەکە کیسە زێڕەکی هەڵگرت ونان و پێخۆربان بردو دەستی بابیان ماچ کردو ڕۆیشتن، پاشا گوتی: کوڕەکانم مادام هەر دەڕۆن بەقسەی من ناکەن یەک تکام هەیە چ لەڕۆیشتن چ لە گەڕانەوە باغ و باغات و شوێنی خۆش و ئاوادانستان کەوتە پێش لێی لامەدەن بۆ میوانداری و پشوودان.

ئەو چل سوارە پێکەوە ڕۆیشتن قۆناغ بە قۆناغ پرسیار بە پرسیار تاگەیشتنە وڵاتی مەغریب زەمینێ وپاشای بابی چل کچەکە. ئەو چل سوارە لە بەر دەرکەی دیوەخانێ پاشای دابەزین و سەلامیان کردو سەلامیان لێوەرگیرایەوە، یەک دوو ڕۆژ مێوانداری کران ئینجا ڕۆژی سێیەم پاشا گوتی: مێوان بەخێربێن سەرچاوم چ خزمەتەکتان هەیە؟ کێ غەدری لێکردینە هەتا حەقتان بۆ وەرگرمەوە، کوڕی گەورە گۆتی: پاشام خۆش بێ ئێمە چل براینەو زانیومانە جەنابت چل کچت هەیە، هاتووینەتە داخوازی کچەکانت، پاشا گۆتی: بەخێر بێن سەرچاوان، بەڵام کچەکانی من مافی خۆیان هەیە هیچیان لە دەست من نین ئەوانە میوانداری دەکەن هەریەک بێتە داخوازیان دەبێ دامەو سەر ترنجانەیان لەگەڵ بکا، ئەگەر بردیەوە ئەوە کچەکە دەباتەوە ئەگەر دۆڕاندی ئەوە سەری دەبڕن.

تائیستاش کەس لێی نەبردینەوە زۆر کوڕە پاشا هاتوون سەریان بڕاوە، ئێوەش جوان وجاحێڵن سەری خۆتان بە بڕین مەدەن، وتیان ئێمە سەرێکمان هێنایەو نایگەڕێنینەوە، بەیانی کورسی و مێز لە مەیدانێ داندران کوڕی گەورە لەگەل کچی گەورە کەوتنە ململانێ خەڵکیش لە تەماشایان وەستایە، کچە کە زۆر زەلیل ولاواز بوو لە دەستی کوڕی گەورە زانی کاروا بڕوا دەدۆڕێنی، یەکسەر سینگ ومەمکی خۆی کردەوەو پیشانی کوڕەکەی دا، کە کوڕە چاوی بەوسینگ و مەمکە کەوت، کە وەک کافوورە ئارامی لە لانەما بە یەک دوو نەقلەی تر دۆڕاندی، برای لەو بچوکتر هات هەر بەو شێوەیە هەتا سی ونۆ برا دۆڕاندیان، ماوە بەتەنها برای بچووک و کچی بچووک، ئەوانیش لە مەیدانێ دانیشتن کچەکە وەک ئەوانی تر ویستی بەهەمان شێوە لێی بباتەوە، کە سینگ ومەمکی پیشانی برا بچوکەکە، دان برا گچکە گوتی: بەڵێ براکانم بەو کەرایەتیە دۆڕاندویانە سەری خۆی داخست هیچ گرنگیەکی بەوکردەوەیە نەدا تاتوانی لێی بباتەوە یەک بەیەک ئەوانی تری داواکرد تا لە هەر چل کچە کەی بردەوە، برایەکانی ئازادکرد، خەبەر گەیشتە پاشا، یەکسەر بانگی مەلای کرد

هەر چل کـچـەکـەی لە چل برایەکـە مـارە کـرد، بوو بە شـایی و هەلـپـەڕکێ، هەرکەس چوە لای بووکی خۆی، ماوەیەک لەوێ مانەوە، کوڕی گەورە گۆتی: پاشام خۆش بی ئێمەش مەملەکەتمان هەیە کوڕە پاشاینە ماڵ و مولکمان بەجێ هێشـتـووە دەبێ ئیـزنمان بدەی بڕۆینەوە، پاشـا گـوتی: کـوڕم هەرچەندە پێم ناخـۆشـە، بەڵام ئێـوەش من ئیـزن بدەن با لەشکرو سـوپاتان بە گـەربدەم وبە دەستورێکی پاشایانە بەڕێتان بکەم، کوری گەورە گوتی: پاشام خۆش بی ئێمە چل، ژنەکانیش چل ئەوە هەشتا سوار ئێمە بەخۆمان لەشکرێکین کێ دەوێرێ بەرامبەرمان ڕابوەستی. ماڵیشـمان ئە تۆخۆش بی گەلەک زۆرە، پاشا وتی: خودا ئاگادارتان بێت و کچەکانم ئەمانەتی ئێوەبن.

ئەوانیش لە تەویلەی مـاڵی بابیـان چل وڵاخیـان ڕاکێشـادەرێ و دەسـتی باوکیـان ماچ کردو بەڕێ کەوتن، دوو سێ ڕۆژ ڕۆیشـتن گەیشتنە دوو ڕیانەکی بەردەکی گـەورە لە ناوەندی ڕێی بوو نـووسـرا بوو ئەوە دوو ڕێگایە، ڕێی هات ونەهات ڕێی هات دە ڕۆژە ڕێیە ونەهات سێ ڕۆژە ڕێیە، وتیـان دەچینە ڕێگا کـورتەکـە کـەسێ ڕۆژە واتە ڕێگای نەهاتێ چونکە ڕێیـەکـە نزیکە بۆ مـاڵەوە. کـەوتنە ڕێی نەهاتێ لە ڕێگادا گـەیشـتـنە باغ وباغـاتەکی هەمـوو مـێـرگ و مێرغوزار بوو هەموو نەوعە گوڵ و گیـایەک و کوروکەکی لێ بوو لێیـان لاداو دەستیـان کرد بە سوحبەت و سەیرانێ برای بچوک کە ناوی (ئەحمەد) بوو پێی گوتن: برایان نەسیحە تەکەی بابمان لە بیرنەچی کە گوتی هەر جێگایەک باغ و باغات بوو ئەوە بێ خاوەن نییە لێی لامەدەن.

وتیـان ئەحـمەد ئەتو هەر ترسنۆکی ئەمە(٨٠) سوارین کێ دەوێری خۆی لە لەشکری ئێـمـە بدات بڕۆ بۆ خـۆت پاڵدەوەو بخـەوە، هەریەکی لە گـەڵ مەعشوقەی خۆی لەلایەک لێی ڕاکشـا. ئەحمەد بەتەنها لە گەڵ ژنەکەی خۆی لە لایەک دانیـشتن وبوون بەحـەرەس شـەوڕاشکا لە ناکـاو نەڕەیەک هات لە ئاسـمـانێـو هاواری کـرد ئەحـمـەدی سـەگبـاب کێ هەیە لە باغ و باغـاتی من دانیشی و لە مێوەو مێوە جاتی من بخوات بێ ئیزن ئەتوئەجەلت بەپێی خۆت بۆمنی هێنای، ئەحمەد: گوتی کـافر وەرە دەنگە دەنگ و گـارە گـاری مەکەبرا کـانم بەخە بەرمـەینە گـوێم هەندەک گـرانەسـەرت بێنە پێش کـە دێو وای زانی دەستی گەیاندە کەرتکە شاخەکی و حەواڵەی ئەحمدی کرد ئەحمەد خۆی لاداو پەلاماری دێوی داشیرەکی لەسەری دا کردی بە دوولەت وەک خیـار شەقی کرد

یەکسەر دابەزی کەپوو ولێوی بڕین وخستیە ناو تورەگەی لاشە کەشی ڕاکێشاو خستیە بن پووش و پەراشی ولێی نوست، بەیانی لەخەو هەڵسان نانیان خواردو سواری وڵاخی خۆیان بوون ڕۆیشتن کەسیان نازانێ شەوێ ئەحمەد چی کردیە.

ئیوارێ دیسان گەیشتنە باغ و باغاتەکی لێی دانیشتن ئەمجارەش ئەحمەد بەبراکانی گۆت برایان ئامۆژگاری بابتان لە بیرنەچێ ئەو باغ و باغاتە بێ خاوەن نییە! گۆتیان دەبڕۆ ئەتۆ هەر ترسنۆکی شەوی دیش وات گوت چ هەبوو لە گۆڕێ. دیسان هەریەک لەگەل مەعشوقەی خۆی لێی نوست، دیسان ئەحمەد بوو بەحەرەس لە سوچێک لێی دانیشت شەو درەنگ داهات دیسان نەڕەیەک لە ئاسمانێ هات گۆتی ئەحمەد سەگباب کێ توانیتی بێتە جێو مەکانی من شەوێ دیش برای منت کوشتیە ئیستا بۆ کوێ دەچی لەدەستم؟ ئەحمەد گوتی ترە ترێ مەکە دابەزە بزانم چت دەوێ کە دابەزی دیتی ئەژدهایەکە لەگەڵ هەناسەی خۆی ئەحمەدی هەڵلوشی ئەحمەد هیچی پێ نەکرا تەنها شیری بە پانی ڕاگرت لە پێش خۆی شیرەکە هەر ڕۆیشت هەر دڕاندی تالە کلکی بوو بە دوولەت یەکسەر کەپوو ولێوی بڕی و بەتەرتیبی جاران خستیە ناوتوورە گەی ولاشەکەی شاردەوە و تابەیانی لێی نوست بەیانی هەموویان لە خەوهەڵسان نانییان خوارد ئینجاسواری ئەسپی خۆیان بوون ورۆیشتن.. هەتا ئیوارە ڕۆیشتن بۆشەوی سێیەم گەیشتنە باغ و باغاتەکی دی هەروەک بە هەشت بوو لە خۆشیان لایاندا دیسان ئەحمەد پێی گوتن برایان ئەو جارە بەقسەم بکەن لێرە لامەدەن ئاگاداریەکەی بابم لە گوێ بگرن، دیسان پێیان گۆت ئەتۆ هەر ترسنۆکی دووشەو رۆیی چ بوو هەتا ئەوشەو ببی، پاش نان خواردن هەریەک لە گەل مەعشوقەی لێی پاڵداوە ئەحمەد دیسان شیری هەڵگرت و لە لایەک بوو بەحەرەس، واسێ شەوە نەنوستیەو بە ڕۆژیش هەر دەڕۆن شەو ڕاشکادیسان نەڕەیەک هات لە ئاسمانێ گوتی ئەحمەد سەگباب دوو برای منت کوشتیەو هاتی لێرە لێی دانیشتی کێوە دەچی لە دەستم؟ ئەحمەد گوتی کافر ترەترێ مەکە دابەزە مەیدانی پالەوانان دەبینی کە کافر دابەزی دێوەک بوو هەموو لەشی(سفربەند) بوو دەستی دایە کەرتە چیایەکی رایوەشاندە ئەحمەدی، ئەگەر خودا دەربازی نەکرد با دەیکردە سەد پارچە، ئەحمەد هێرشی کردە سەری شیرەکی لێدا شیر بوو بە دوو پارچە شیری براکانی یەکە یەکە هێنا هەمووی

شکان، دێو گۆتی ئەحمەد خۆت ماندی مەکە شیرو تیرکار لەمن ناکات ئەمن ناوم دێوی سفر بەندە وەرە دانیشە بانگی برایەکانت بکە ناچار ئەحمەد چوو دانیشت بانگی برایەکانی کرد هەر کەسەی دەستی بۆ شیروتیرو چەکی خۆی برد کواشیرم؟ کواتیرم؟ ئەحمەد گۆتی برایان خۆتان ئەزیەت مەدەن، شیروتیری ئێوەم هەموو بەکارهێنایە هەمووی شکان زۆرم پێ گوتن بەقسەی بابم بکەن بەقسەتان نەکردم دوو شەوی پێشووش دوو دێوم کوشتیە ئەوەش کەپوو ولێوەکانیان، بەڵام ئەمشەو ئەوە دێوی سفربەندەو براگەورەی ئەوانەیە هیچمان لەگەڵی پێ ناکرێ هەرچی ئەمر بکات دەبێ جێبە جێی بکەین.

هەموو لە دەورەی کۆبوونەوە، سفربەند گۆتی دەتانەوی(٣٩) کەستان بگێرمەوە. یان ئەحمەدی بگێرمەوە، ئەحمەد گوتی کاکە من دەمێنمەوە ئەوانیش بابرۆن. برایەکان رۆیشتن خێزانی ئەحمەدیان لەکەڵ خۆ برد، ئەحمەد لەگەڵ دیۆی سفربەند لەوێ ماوە لەگەڵ دێوی چوونەوە ناو قەسرێ لەوێ دێوی سفربەند گۆتی: ئەحمەد دەزانی من ئەتۆم بۆچی گێراوە ئەحمەد گۆتی: بلێ هەر ئیشەکی بەمن بکرێ جێبەجێی دەکەم. دێو گۆتی: ئەحمەد ئەمن حەفت ساڵە عاشقی کچی پاشایەکم ناوی (چل کەزی)یە من هیچم پێناکرێ لە گەری دەبێ بچی بۆم بێنی ئەگەر چل کەزیت هێنا ئەوە ئیزنت دەدەم ئەگەر نا لەسەرت دەدەم.

ئەحمەد گۆتی رێگاکەم پێشان دە دەچم بە تەمای خودای، دێو گوتی هەتا حدودی ئەوان لەگەڵت دێم پاشان دەبێ بەتەنها برۆی من ناتوانم بێمە ناو مەملەکەتی ئەوان..

پێکەوە رۆیشتن هەتا حدودی مەملەکەتی(چل کەزی) لەوێ دێوی سفربەند گۆتی: ئەحمەد ئەوە حدودی ئەوانە من ناتوانم زیاتر ئەتو کەیفی خۆتە.

ئەحمەد خوداحافیزی لە دێوکردو بەتاقە سوار رۆیشت ماوەیەک رۆیشت دیتی کابرایەک لاقەکی شکایەو یەکی ساغە گۆپالێکی لە دەستە غار ئەداتە رەوەمامزی، مامزەکی بە کۆمکی گۆپاری دەگرێ ئەگەر قەڵەو بوو ئەوە دەیکاتە بریانی و دەیخوا ئەگەر لاواز بوو ئەوە بەرەڵلای دەکا... ئەحمەد گۆتی: پەککو سەگبابی شەلەوەرە بەلاقەکی ئەو هابەغاربی... شەلە گۆتی کەس لە تۆ سەگباب تر نیە، ئەوە حەفت ساڵە دێوی سفربەند بەدوای چل کەزی داوێلە ئەتو دەچی لۆی دەینی بەخۆی ناتوانی، ئەحمەد گۆتی هەردەچم... گۆتی

ئەحمەد بمکە رەفیقی خۆت بەکەلکت دێم، گوتی باشە بەگەری کەت. پاش ماوەیەکی رۆیشتن دیتیان وامارەکی بۆرەسەری دە دو مارەکی رەش نایەو دەیەوێ بیخوات، ماری رەش زۆر زەلیل بوو لە دەستی ئەحمەد نەیکردە نامەردی تیرەکی لە مارە بۆرەی داو کوشتی، ماری رەش گەڕاوە گۆتی ئەحمەد بخوازە چت دەوێ تابۆت بکەم، ئەحمەد گۆتی: مارە ئەمن نازانم ئەتوچی و چیت هەیە؟ هەرشتەکی باشت هەیە بمدەرێ ڕازیمە. ماری رەش ئەنگوستیلەکی دەرهێناو دایە ئەحمەدی گۆتی ئەحمەد لە کاتی تەنگاوبووی ئەو ئەنگوستیلەی بادە من حازردەبم... دیسان رۆیشتن لە رێگادیتی جۆگەلە ئاوەکی بچووک هەیە لەوبەردی مێروی لێیە وا بەکەیفی خۆیان خواردن دەخۆن و شتیان زۆرەو هەرزانیە لەو بەری جۆگەی وا لە برسان دەمرن و هیچ نییە بخۆن گرانیەکی تەواوە دەیانەوێ بپەڕنەوە بە جۆگە ئاوەکەدا دەچن ودەمرن، زۆر هەوڵدەدەن بپەڕنەوە، بەڵام بێ سوودە ئەحمەد هەستا پردەکی دروستکرد بەچیلکە داری بۆمێروەکان پێی پەڕینەوە هاتن خواردنیان دەبردو دەگەڕانەوە خەبەر گەیشتە شای مێروان کە هەرزانی پەیدا بوو گۆتی چۆن؟ گۆتیان بەنی ئادەمەکمان لێ پەیدابوو پردی لۆ دروست کردین لە مردن رزگاری کردین. شای مێروان هاتە دەرێو گۆتی بەنی ئادەم لە جیاتی ئەو چاکەی لەگەڵ قەومی منت کرد بخوازە مالێ دنیایێ هەتا خەنیت بکەم. ئەحمەد گۆتی ئەی مێرو ئەتو بە خۆت چیت هەتا مالێ دنیات هەبێ؟ گۆتی پاڵەوان منیش بای خۆم هەیە. ئەوە دوومووی منت لە لابێ هەر کاتێ کارەکت هەبوو دوومووی من هەر زورینە دەگەمەلات و بەکەلک دێم، ئەحمەد گۆتی: باشە لەوێ رۆیشتن دیتی گورگەکی لاوازی شەل و لەڕ خەریکە مەڕەکی لە شوانەکی بدزی... گورگ پارێزی بۆمێگە لێ برد مەڕەکی گرت و بردیە ناوکەندێ کە بیخوات گورگەکی گەورەو قەڵەو هات سینگەکی لە سینگی گورگە لاوازەکەداو فرێی داو کەوتەسەر خواردنی کە لەشەکەی ئەحمەد گۆتی بزانە لە هەموو شوێنێک هەتا لە ناو ئاژەلانیش بێهێز هەر خوراوە... تیرەکی هاوێشتە ناو کەوان و لەگورگی قەڵەوی داو کوشتی گورگە شەلەو لاوازەکە گۆتی: ئەحمەد بخوازە چت دەوێ بۆت بکەم. ئەحمەد گۆتی: گورگە شەلە ئەتوچت پێ دەکرێ بۆ من؟ گۆتی: ئەحمەد منیش بای خۆم هەمە ئەو دوومووەی منت لەلابێ هەرکاتی پێویست بوو هەریان زورینە من دەگەمەلات گۆتی باشە دیسان رۆیشتن، گەیشتنە ئاشەکی دیتیان باراشی

لەسەرە، لەبنەوە دووکەس ئاردەکە لە هێلەک دەکەن دوو دەیکەنە هەویر دوو دەیکەنە نان، کابرایەکیش لەوێ دانیشتیە نانەکەی دەخوات، هەر هاوار هاواری بوو ئەی هاوار مردم لەبرسان ئەحمەدیش لەگەڵ شەلەی گەیشتنێ سەلامو عەلەیکم و عەلەیکمە سەلام ئەحمەد گۆتی: دوونانیش بدەنەمە. کابرا گۆتی ئەمن دەمرم لە برسان لۆ غەدری لەمن دەکەن؟ ئەحمەد ڕەبی دەمری لەبرسان سەگباب، ئەو هەموو نانەی دەخۆی بە دوو نانی من دەمرێ لەبرسان؟ ڕەبی حەیاتت لێ دەبڕا، بوو بەشەڕە قسەیان گۆتی ئەحمەد ئەتو دەچی چل کەزی لۆسفربەندی دەینی لێرەش غەدرێ لەمن دەکەی؟ حەفت ساڵە سفربەند وێلە بەداوی چل کەزی پێی نەهاتیە ئەتو دەچی لۆی دەینی، بەڵام قەیدی ناکا دەمکەیە پیاوی خۆت؟. ئەحمەد گۆتی قەیدی ناکا، بەڵام ئەتوو چۆن بەمن تێردەبێ؟ گۆتی ئاسانە ئەتو قایش بەندی پێشتر بدەمن حەقت نەبی، ئەحمەد قایش بەندی دایە، کە لەزگی خۆی بەست زگی گوشرا لە ڕۆژەک و دور ڕۆژ نانێکی دەخوارد ڕۆیشتن بونە سێ هاورێ پاش ماوەکی لەگەریەکی لە ناوچیای دەچونە خوارێ لە زارگەری دیتیان وا زەلامەکی زۆر گەورە ڕاوەستایە لاقەکی لەوبەری گەریە لاقەکی لەوبەری بێرەکی لەدەستەکام لاگرانتربێ ئەوە بێرەخۆرەکی هەڵدەگری دەیخاتە لای دی کە سووکە ئەحمەد گۆتی: دەک خوا قوەتت نەدا چەند بەقوەت و گەورەی، کابرا گۆتی خواقوەتی تونەدات لە تۆش بە قوەتترم ئەوە حەفت ساڵە سفربەند وێلە بەدوای چل کەزی ناوێری نزیکی مەملەکەتی بابی وی ببی ئەتو دەچی لۆی دەینی، حەسودیش بەقوەتی من دەبەی ئێستا دەمکەیە پیاوی خۆت ئەحمەد گۆتی: فەرموو ئەویش بەگەری کەوت ڕۆیشتن تاگەیشتنە شاری چل کەزی لەبەر دەرگای دیوەخانێ دابەزین زۆریان بەخێرهێنان یەک دوو ڕۆژ ئیسراحەتیان کرد. پاشا لێی پرسین کاکە خێر بوو هاتوونە مەملەکەتی من چیتان دەوێ تابۆتان جێبەجێ بکەم؟ ئەحمەد گۆتی: پاشام خۆش بێ پێویستم بە هیچی تۆ نیە هاتیمە بۆ چل کەزی، پاشا گۆتی یاخوا بەخێر بێی پاڵەوان کچ لە دونیایێ زۆرو زەوەندە چل کەزی شەرت و شروتی گەلەک زۆرە مەکربازە دەتفەوتێنی تۆش جوان ولاوی نامەوێ بتفەوتێنێ کچی هەر پاشایەکی داوابکەی دەتدەنێ!.

ئەحمەد گۆتی پاشا سەرەکم هێنایەو نایگێرمەوە. پاشا گۆتی: باشە پاڵەوان، چل کەزیش لەولای کە ئەحمەدی دیت لاوێکی زۆر نەجیب وڕێکەو

قابيلی خۆيەتی لەفكری خۆی گۆتی: هەتا كەنگی ئەو كورە پاشايانە بێن باوكم بيان فەوتێنی منيش واپير دەبم؟ واچاكە لەگەڵ ئەو پاڵەوانەی رێک بكەوم.. خۆی گەياندە ئەحمەدی پێی گوت باوكم گەلێک ساحيرو فێلبازە چەند شەرتەكی هەيە، يەكەم شەرتی دەبی ئەو باگوردانە ئاسنە بەو بيورە لبادە بقەرێشی قەتيش ناقەرشێ باگوردانی ئاسن بە بيوری لباد، بەڵام كەبيورت لێدا ئەوە ناوی خودای لەگەڵ بێنە سحرەكە بەتاڵ دەبێو باگوردان دەقەرشێ..
بەيانی پاشا بانگی كردوەوە پاڵەوان ئەوە شەرتی يەكەمە ئەو باگوردانە ئاسنە بەوبيورە لبادە بقەرێشە....ئەحمەد دەستی گەياندە بيورە لبادەكە يەكەمی لێدا ناوی خودای هێنا..كەمێک دەرزی برد دووەمی لێدا قەرشی تەواو... سێيەمی لێدا باگوردان بوو بە دوو پارچە... پاشا گۆتی وانييە من دەزانم مەسەلە چييە، بەڵام باوابێ.. گۆتی پاڵەوان ئەوە شەرتی دووەمە ئەو جامە پڕشيرە دەبەيە سەر ئەو منارە گەورە بڵندە دادەنێی بێ ئەوەی پشكەكی لێ برژێ گوتی باشە مارە رەشەكەی بەبيرهاتەوە ئەنگوستيلەی بادا ماری رەش حازر بوو گۆتی مارە ئەوشەرتەم لەگەڵ پاشا هەيە گۆتی ئاسانە ژەهری خۆی لە شيرەكە كرد شيرەكە پەيت بوو بوو بەماست بردی لەسەر منارەكەی دانا منارەكە زۆر بلند بوو دونيای لێ ديار بوو غەريبی مەملەكەتی خۆيانی هەڵسا فرمێسكەكی لە چاوی هاتە خوارێ كەتە بنی هەندەک گۆتيان پشكەک لەشيرەكە رژا، كەتاميان كرد سووربوو، گۆتيان بابە ئەوە فرمێسكە كەوتە خوارێ ئەو شەرتەشی بردەوە. پاشا گۆتی پاڵەوان ئەوە شەرتی سێيەمە... دەبێ سەگەكی پەيدا بكەن لەگەڵ سەگی من بەشەڕ بێت ئەگەر سەگی من بەزی ئەوە دەبەيتەوە ئەگەر نا لەسەرت دەدەم... ئەحمەد گۆتی باشە گورگە شەلەی بەبيرهاتەوە دوومووی گورگەی هەر زوراند گورگ لەپێشی ئامادە بوو گۆتی بلێ پاشا، ئەحمەد گۆتی دەبێ سەگی پاشام لۆبخنكێنی، گۆتی پاشا ئەمن بێ تاقەتم، لاوازم توانای بەزاندی سەگی پاشام نيە، بەڵام مۆڵەتی هەفتەيەكی لێ وەربگرەو من قەڵەو بكەوەو دووسێ مەرم دەرخواردبدە هەتا قەڵەو وبەتاقەت دەبمەوە ئينجا بۆت دەخنكێنم... ئەحمەد گۆتی باشە روخسەتی يەک هەفتەی لە پاشای خواست گورگی دابەست قەڵەوی كردەوە، ئينجا گۆتی پاشا مەيدان ئامادەيە پاشا سەگی خۆی بەردايە مەيدانێ ئەحمەديش گورگی بەردا گورگ خۆی خستە سەرخاكی سەگی پاشاش لە دەوری دەهات و دەچو دەيحەپاند لە

ناکاو قورگی سەگی پاشای گرت و بەری نەدا هەتا خنکاندی.. گوتی پاشا بردمەوە گوتی پالەوان ماوە.. گوتی بەلێ گوتی شەرتی چوارەم... ئەتو پیاوی خوت بنێرە ئاوی حەیاتێ منیش پیاوی خوم دەنێرم کامیان پێشان هاتەوە ئەوە گرەوەکە دەباتەوە گوتی باشە ئەحمەد گوتی شلە روژتە، شلە گوتی بەلێ روێشتن چوولەبن دارەکی لێی پالداوە پیاوی ئاغاش چوو ئاوی حەیاتی هێناو هاتەوە لەسەر رێگا گوتی هامن هێنام ئاوی حەیاتی ئێستا لەسەری ئاغەت دەدەن شلە لێی هەستاوەو گرتی و پارچە پارچەی کردو ئاوی حەیاتی بردو روێشت گوتی ها پاشام ئەوەش ئاوی حەیاتی ئەحمەد گوتی پاشام چت ماوە گوتی شەرتی پێنجەم گوتی بلێ گوتی ئەمشەو لە هەموو زراعەتەک و دانەوێلەکی رەکی لێک دەدەم دەبێ بو بەیانی هەمووم بوجودابکەیەوە گوتی باشە.. پاشا هەمووشتەکی تیکەلّ کرد ئەحمەد دوومووی شای مێروانی هەر زوراندشای مێروان ئامادە بوو گوتی ئەمرکە پاشا، گوتی پاشا ئەو داوایەم لێ دەکات گوتی ئاسانە بانگی مێروانی کرد بە ماوەی یەک سەعات هەمووی لێک جودا کردەوە ئەحمەد چوولێی نووست بەئیسرا حەت بەیانی گوتی پاشا بردمەوە گوتی ماوە گوتی چ ماوە گوتی شەرتی شەشەم... پالەوان ئەوروّ ئەمن چێشت و خواردنەکی زور لێدەنیم دەبێ هەمووی بخون بەتەنها ئێوە، ئەگەر بردتەوە ئەوە چل کەزیت دەدەمێ ئەگەر نا لە سەرت دەدەم. گوتی باشە... پاشا چێشت و خواردنەکی یەکجار زوری دروست کرد کابرای سەر ئاشی گوتی: ئەحمەد پاشا جەژنی منە قایش بەندەکەم بکەوەو ببینە... خواردن تەرتیب کرا ئەو هەموو مەنجەلّ وسنیی و قاپە رێزکرا دەستیان بە خواردن کرد کابرای ئاشی لێی دانیشت هەموو قاپ و مەنجە لە کانی لێستەوە هەر هاوارهاواری بوو ئەی هاوار مردم لەبرسان وەرە بەشارەکی نەفەرەکیان پێ تێر ناکری ئەحمەد گوتی پاشا بردمەوە پاشا گوتی ماوە، کابرای گەورە بێردارەکە بێری بلند کردو وە بەرخانوو مالّی پاشای هەردا گوتی ئەحمەد پاشا ئەمرکە هەتا شاری بەکاملی وەرگێرم وسەراوبنی بکەم... ئەحمەد گوتی نەکەی پاشاش گوتی نەکەی وا قەبولم کرد توّیە نەکەی شارم وێران مەکە چل کزی هەرقابیلی توّیە، ئەحمەد چل کەزی و دارو دەستەی خوّی حازر کردو ئیزنی لە پاشای خواست ولێیدا روێشت، گەیشتنەوە شوێن کابرای بێردار ئەحمەد گوتی کاکە ئەوە جێومەکانی توّیە توّ کاری خوّت کرد لێرە جێ دەمێنی لای وی، کە روێشتن...

گەیشتنە شوێنی ئاشەوانی گۆتی: کاکە ئەوەش جێی تۆ خوا حافیز مەمنونی تۆشین... گەیشتنە شوێنی کابرای شەلە گۆتی کاکە ئەوەش شوین و مەکانی تۆ خوداحافیز لەگەڵ چل کەزی رۆیشتن هەتا نزیکی جێومەکانی دێوی سفربەند بوون ئەحمەد گۆتی ئەی پەری زادە ئەمن ئەتوم لۆ دێوی سفربەند هێنایە شەرتم لەگەری هەیە... دەبێ شەرتەکەم بگەیەنمەجێ... چل کەزی گۆتی ئەگەر دەمزانی ئەمنت لۆدێوی سفربەند هێنایە زوو دەمفەوتاندی، بەڵام نیستا هیچ چارەیەکەم نییە، بەڵام ئەحمەد من لە کۆنەوە بیستومە دێو روحیان لای خۆیان نیە ئەگەر یارمەتیم بدەی چارەکیش لەوی دەکەین ئەحمەد گۆتی زۆر باشە... رۆیشتن گەیشتنە ماڵی دێوی سفربەند.... دێو کەوتە بەزم وهەڵپەڕینی لە خۆشیان... سفربەند گۆتی چل کەزی تۆلۆمن هاتی، بەڵام ئەو زەلامەش پێویستە لە زیندان بکەین ونان و ئاوی نەدەێنی تالە برسان دەمرێ. ئەحمەد یان لە ژورەکی تاریک کرد رۆژێ دێوە دەچووە دەرێ لۆگەران و ڕاوی چل کەزی ئەحمەدی دەهێنا دەرێ و یاریو سوحبەت و سەیرانیان پێکەوە دەکرد کاتی هاتنەوەی دێویش لە ژورێکی دەکردەوە.... رۆژەک، دوو، سێ، چوار ئەحمەد گۆتی چل کەزی ئەتو هێواری خۆت نەخۆش بکە کە دێوهاتەوە پێی بلێ من بەتەنهام لێرە زویرو عادز دەبم کەس نییە یاریەکی لەگەڵ بکەم کەس نییە قسەیەکی لەگەڵ بکەم من وەختە شێت بم لێرە بەتەنها ئەتۆ رۆژی لۆخۆت دەچیە ڕابواردنێ ئەمنیش لێرە بەتەنها لەسجنە دامە لۆ روحی خۆت پیشانی من نادەی هەتا ئەتودێیەوە ئەمن لۆ خۆهەر سوحبەت و رابواردنی لەگەل دەکەم چل کەزی وای کردهەتا دێوهاتەوە خۆی نەخۆش کرد، دێو گۆتی چل کەزی دەتەوێ یاری لەگەل روحی من بکەی روحی من لەناو گەسکی ماڵێ دایە، لۆ ئێواری هەتا دێو گەڕاوە گەسکی ناو ماڵێی جوان رازاندەوەو یاری لەگەل دەکرد. دێو پێکەنی گۆتی بزانە ئەوەش ئاقری ژنانە روح کو لەناو گەسکی ماڵێدا دەبی چل کەزی دەستی بەگریانێ کرد گۆتی دیارە ئەتولەمن تەئمین نی دێو گۆتی چل کەزی روحی من لە ناوجە رگی بزنەکێوێەکیە لەو چیایەی هەفتەی جارەکی دێت ئاوی لەپشت ئەو بەرزاییە دەخواتەوەو دەڕوا بەیانی دێو رۆیشت رۆژی هەینی بوو ئەحمەد چوو رەبیەکی لە نزیک ئاوو کانیەکەی لێداو خۆی حەشاردابزنە کێوی هات کەنزیکی ئاوەکەبوو بۆنی ئادەمیزادی کردگەڕاوە دیسان هاتە سەر ئاوەکەو گەڕاوە ئاخیری زۆر هیلاک بوو لە تێنان هاتەسەر

ئاوەکەی دەوی پێوەنا هەتا تێری خواردەوە لێیکەوت ئەحمەد تیری خستە ناوکەوانی و ناوی خوای لێهێنا تیرەکی لە بزنەکەیداو کەوتە خوارێ غاری داسەری بری وزگی دڕاندوجەرگی دەرهێناو دێو گەیشتە سەری و گۆتی ئەحمەدی پالەوان من کردم ئەتو نەیکەی بەقوربانت بم ببمەخشە. ئەحمەد گۆتی برۆمەلعون جەرگی بزنەکەی پارچە پارچە کردو روحی دێوی دەرهێناو خستیە سەر بەردەکی پارچەپارچەی کرد دێو لە عاسمانی هاتە خوارێ حەیاتی لەبەر براومرد گەڕاوە لای چل کەزی بووبەبەزمو سەیران هەتا پێیان هەرگیرا زیڕومارٍیان لە مالێ دێو بارکرد هاتنەوە بەرەو مەملەکەتی خۆیان و گەیشتنە ناو گوندی کۆمەلە مندالەکیان دیت یاری دەکەن یەک لە دوریان دانیشتووە بەتەنها ئەحمەد چوەلای گۆتی کوڕم لۆ بەغەریبی لێرە دانیشتی گۆتی ئەوانە غەدرم لێ دەکەن من غەریب وبێ بابم گۆتی لۆبابت مردیە؟ گۆتی نا بابم دێوی سفربەند لۆخۆی بردیە ئەحمەد دەستی بەسەریدا هێناو گۆتی کورم برۆ بەداکت بلێ بابم هاتەوە.. مندالەکە غاری دا مالێ و گۆتی دایە بابم هاتەوە...
دایکی گۆتی قوڕبەسەر دایکت بابت دێوی سفربەند لۆخۆی بردیە هاتنەوەی چی؟ ئەحمەدیش لەو دەمەی وە ژورێ کەوت ژنەکە کردیە هاواروبانگ کردن ئەحمەد هاتەوە خەلکیان بەسەر سەری وەربوو بوو بە شایی و هەلپەرین لە ناو شاری و هەموو مەملەکەتی ئەحمەد چووە دیوەخانێ، بابی نەمابوو برای گەورە ببوە پاشا براگەورە کورسی لۆ بەجێ هێشت و پێی گۆت ئەحمەد ئەو کورسییە هەرقابلی تۆیە بریا بابیشم مابایەو ئەتوی بە چاوی خۆی بدیبایە ئەحمەد دەستی براگەورەی ماچ کردو لەسەر کورسیەکەی داناوەو چوە مالێ خۆی چل کەزیشی لە خۆی مارەکرد... لەگەلێ هەردوو ژنەکەی بەخۆشی لێی دانیشت و عومرێکی درێژی پاش ئەو بەسەرهاتە بردە سەرچەند ئەولادی لێیان بوو...
منیش هاتمەوە کارەکم دڕاوچم پێ نەبڕا.
هەزار رەحمەت لە گوێ ڕادێران بێ....

*** ئەم هەقایەتەم لەسالی ١٩٨٣ لە(خالە کاکۆلی فریزی) وەرگرتیە کە ئێستا لە ژیان نەماوە هەزار رەحمەت لە گۆڕەکەی بێت.**

**تێبینی / کاتی خۆی کاک (تاریق جامباز) بەناوی چل کەزی کتابێکی بلاوکردەوە، بەلام ئەم هەقایەتە هیچ پەیوەندیەک و لێکچونێکی لەگەل چل کەزی ئەو نییە.**

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەوردتر نەبوو، کەس لە شەیتاتی مەلعونتر نەبوو، کەس لە درۆزنی ڕووڕەشتر نەبوو، لەولاتی رۆمی (برایم پاشا) هەبوو پاشایەکی زۆر گەورەو بەدەسەلات بوو، دوو کوڕی مێردمندارەی هەبوون. ئەوەی فەراژیان ناوی (شازادە ئەرچە) بوو ئەوی کچکەتر ناوی (شازادە شێرۆ) بوو بابیان پیر ببوو... رۆژەکی خەرکەکەی بانگی دیوەخانێ کرد گۆتی... خەرکینە ئەمن ئەوە پیر بویە لەسەر لێوی قەبریە یەکەکی لە کوڕەکانم هەڵبژێرن هەتا لە دوای من ببیتە پاشا، خەرکەکە (شێرۆیان) پێ باشتر بوو چونکە ئەو لە (ئەرچەی) ئازاو ڕەشیدتر بوو لۆیە (شێرۆیان) هەڵبژارد هەرچەند برا کچکەش بوو، پاشا تاجی پاشایەتی لەسەری خۆی هەڵگرتوو لەسەری شێرۆی دانا، ئەویش تاجی پاشایەتی دانا سەرسەری برا گەورەی کە شازادە ئەرچە بوو گۆتی ئەو براگەورەیە دەبی هەر ئەوببی بە پاشا...
(ئەرچەش) گۆتی برام خەرک ئەتوی هەڵبژاردیە دەبێ هەر ئەتوببی بە پاشا.
عەیامەک پێچوو ئەرچە خووڕەشت و هەلسوکەوتی بەرامبەر براکچکەی گۆڕا هەموو دەمەکی [illegible] بە دوای فرسەتەکی دەگەڕاکە بیفەوتێنی...
رۆژەکی گۆتی برام شێرۆ خۆ ئەمەلێرە سجن نینە لۆ رۆژەکی نەچینە ڕاوێ ئەو دەشت و بیابانە هەر لە مارێ دانیشتینە... شێرۆ گۆتی برام کوت پێباشەوا دەکەین بەیانی جەماعەتی راوێان حازر کردوو وراخیان هێنانە دەرێ خواردن و پێخۆرەکی زۆریان حازر کرد، بابیان لەو راوەی دوو دڵ بوو بانگی شێرۆی کرد گۆتی کوڕم ئەمن لە ئەرچەی دوودڵم دەیەوێ بتفەوتینی دەبێ زۆر ئاگات لە خۆبی پێم باشە لۆ ئەو سەفەرەی نەچی... شێرۆ گۆتی... بابە؟ کو براگەورە برا گچکەی دەفەوتێنی قەت ئەو فکرانە لەئێمە مەکە. گۆتی کوڕم ئەمن زۆر لەو سەفەرەی دەترسێم بەس قەیدی ناکا دەچی هەرو کەیفی خۆتە.
بەیانی لەگەر جەماعەتی سواری ئەسپان بوون و دەستی بابیان ماچ کرد لە شاری چونە دەرێ. سێ شەو وسێ رۆژان رۆیشتن هەتا گەیشتنە ناو قەمیش

وقەمیشەلانەکی لەویّ پەڕینەوە لەسەر گردەکی خێمەی خۆیان هەرداو خەرکەکەش کە لە گەریان بوو لە دەورووبەری وان خێمەیان هەردا... راودەستی پێکرد هەریەک لە لایەکی ئەو بەدوای مامزەکی یەک بەدو ڕیویەکی کەوت... خەرکەکە مەشغول بوون بەڕاویّ (ئەرچە) گۆتی (شێرۆ) برام ئەمەش نەچینە راویّ بە دوای نیچیرەکی بکەوین راودەست پێکرایە هەر ئەمە ماینە... شێرۆ گۆتی بابچین بە جوتە سوارە ئەوانیش جلەوی وراخیان شۆڕ کردەوە بەرەو دەشت و بیابانیّ هەتا ماوەکی زۆر هیچ رانەوەستان بەخۆو بەوراخان یەکجار هیلاک بوون لە تێنان... شازادە (ئەرچە) گۆتی برام (شێرۆ) لەو ئاقارەی بیرەک هەیە بابچین بزانین ئاوی تێدایە... شێرۆ گۆتی فەرموو برام... کە چوونە سەربیرەکە دیتیان لە بنیّ بیریّ تروسکاییەک ئاودیارە، شازادە ئەرچە گۆتی برام شێرۆ ئەتو ئەمن شۆڕکەوە ناو بیریّ هەتا ئاوی هەرێنجین لۆ خۆمان و لۆوراخان... شێرۆ گوتی برام ئەمن برا گچکەمە دەبی ئەمن بچمە ناو بیریّ، نابی ناکریّ، ئەرچە رازی بوو شێرۆ بچیتە ناو بیریّ... ئەرچە شێرۆی بە گوریسان شۆڕ کردەوە ناوبیریّ یەک دوو دۆلکە ئاوی پڕکردو ئەرچەش هەری کێشان، کە وراخی ئاودان، بە خۆی تێری خواردەوە گۆتی شێرۆ برام لەویّ بمرە تازە قەت هەرت ناکێشمەوە، وراخی شێرۆی لە دوو خۆی شەتەک داو بەرەو لای جەماعەتی گەڕاوە، جەماعەتی پرسیان ئەدی کا شێرۆ؟ ئەویش چاوی خۆی لە گریانیّ سۆرکردبوون، گۆتی برایان لە کەناری زێی ڕاون دەکرد شتەکی گەورە لە ناو زێی بەدەرکەت شێرۆ گۆتی ئەمن دەچم ئەوشتەی دەگرم، کورە داکت چاک بابت چاک نەکەی نەچی! فایدەی نەبوو چوو، وەختەک شتەکە لۆلای وەرسوڕاوە کەدیتم نە هەنگەکی گەورە بوو شێرۆی قوتداو چووەبن ئاویّ چەندی بەمەلە بەدوایدا چووم هیچ فایدەی نەبوو بردی.

خەڵکەکە بەشین و گریان بەرەو شار گەڕانەوە... کەبرایم پاشا ئەو بەسەرهاتەی بیست، گۆتی کوڕم بەخوای گەورە ئەزانم وانیە، بەڵام با وابیّ قەیدی ناکا ئاخرەتیش راستی رۆن دەبیتەوە، خەڵکەکە بۆ ماوەکی جلی رەشیان لە بەرکرد ئینجا ئەرچە لە جێی شێرۆی بووە پاشا.

بابێینە وەسەر باسی شێرۆی کە ئەرچە لە ناو بیرێی بەجیّ هێشت... پاش ماوەکی کاروانی خواجە (حەسەن توجاری) بەوێدا هات لەسەر ئەوبیرە ئاوەی دانیشتن... گۆتیە پیاوەکان دەی ئاویّ هەرکێشن چای لێنێن وراخان ئاودەن،

که دۆلکەیان خستە ناو بیرێ هەریان کێشا نەیان توانی خواجە حەسەن توجار گۆتێ هەی عەمرتان نەمێنێ ئەگەر بەردیش بی دەبی هەری کێشین، بەلاّم بێ فایدە بوو دەبی هەری کێشین گۆتی وراخان بینن وراخیان هێنان بیست وراخیان بە یەکەوە بەستەوە گوریسیان راکێشان کە بەسەرکەوت دیتیان وا فەرخە دێوەک لەناو دۆلکەی دانیشتیە عەینەن جەناوەرە کە هینایانە دەرێ بەهەمووان دایاننا... خواجە حەسەن بردیە لایەک بەتەنها لێی پرسی. تۆچی؟ چ کارەی لێرە؟... گۆتی من دەروێشم لە شاران دەگەرێم، ویستم ئاوێ لۆ خۆ لەو بیرەی هەرکێشم لە بێتاقەتی کەوتمە ناو ئەو بیرەی ئەوە دوو رۆژە لە ناو ئەو بیرەیە ئەتوش لێم بویە (خدری زیندە) وا نەجاتت دام... خواجە حەسەن گۆتی کورم ئەتو دەروێش نی، بەلاّم بادەرویش بی، ئەمن خواجە حەسەنم باش توجاری ئێرانێمە لەگەلّمن دێی بتبەمە ئیرانێ یان خۆت دەڕۆبەلایەکی کەیفی خۆتە... شێرۆ گۆتی ئەمن تازە قەرداری تومە دەبی لە گەرە تو بێم... باشە ناوت چییە؟ ناوم (بەچە دەروێشە)... لەگەلّ حەسەن توجاری رۆیشت لە ناو کاروانی بە بەچە دەرویش ناوی دەرکرد... کاروان رۆیشت بەرەو ئێرانی کەوتەرێی هەتا گەیشتەوە ولاّتی خۆیان قوناغ بەقۆناغ هەتا گەیشتە مارێ... لەوێ سەروریشی تراشی و دەستە جلەکی پاشایانەی لە بەرکرد... کورە پاشایەکی قیتوقۆز نەکەی نەخۆی هەر تەماشای بکەی هەندە شتەکی نەجیببوو. واعادەت بووکە (خواجە حەسەن) لەهەر سەفەرەکی دەگەڕاوە دیاریەکی جوانی لۆ (مەزهەر)پاشای ئێرانێ دەینا ئەو جارە پێنج رۆژی پێچوو هەرسەریشی لە دیوەخانێ پاشای نەدا. پاشا پرسی هۆی چییە (خواجە حەسەن) ئەو جارەی سەریشی لە دیوەخانێ نەدایە... گۆتیان پاشا (خواجە حەسەن) کورەکی لەگەرە خۆی هینایە هەندە نازدارە رۆژێ هەتا ئێوارێ والە دیاری دانیشتیە هیچ ئیش وکار ناکات. ناردی بە دوای کە هات گۆتی (خواجە حەسەن) کا مێوانەکەت؟... گۆتی پاشا میوانی چی؟ گۆتی بامێوانەکت هەیە لۆ لەگەرەخۆت نەهینایتە دەێوەخانی... گۆتی پاشا بەچەدەروێشەک لە برسان لەرێ کەوتبوو لەگەرەخۆم هینایتەوە کوبێتە دیوەخانێ جەنابت؟ پاشا گۆتی دەبی بێتە ئیرە. خواجە گەڕاوە مالێ بە بەچە دەروێشی گوت... گوتی نایەم، ئەمنو دیوەخانێ پاشای کوجا مەرحەبا. خواجە گەڕاوەلای پاشای... گۆتی پاشام خۆشبی بە چەدرویش ئەرێ شەرم دەکەم من

دەروێشەکی لاتو هەژار بێمە دێوەخانی پاشای چ بکەم؟.. پاشا گوتی نابی دەبێ هەربێ... ناچار بە چە دەروێش وەگەری کەوت... ئەچووە دێوەخانێ خەڵکەکە هەموو بەگەورەو بچووک بە پاشاو وەزیر سەریان ... ئەو لاوەیان دیت... پاشا لەلای خۆی داینا گۆتی کورم خەلکی چ شارەکی؟ ناوت چییە؟ گۆتی پاشام خۆشبی من جێو مەکانم نیە هەر دەمە لە شارەکم ناویشم بەچە دروێشە...گۆتی کورم درۆ عەیبە لۆ پیاوان ئادگاری تۆ دەروێشی کوجامەرحەبا... گۆتی پاشا لە باب و باپیرەوە دەروێش بووین هەتا ئێستا... ئیوارە خواجە گۆتی کورم بەچەدروێش شەو داهات بابرۆینەوە. پاشا گۆتی نابی برۆنەوە، ئەگەر ئەتوش برۆی بەچە دەروێش نابی بڕوا دەبی ببیتە قاوەچی لە دێوەخانی من... پاشا نەکەی داکت چا بابت چا پاشا گۆتی نابی ناچار بەچە درویش لە دیوەخانی بەجێما بە در ساردی گەڕاوە ماڵێ. (مەزهەر) پاشای ئێرانێ دوو وەزیری هەبوون نجومدار بوون هەموو شتیان دەزانی یەکیان ناوی (خەزەندی) وەزیر ئیسلام بوو (بەهمەندی) وەزیر ئاگرپەرست بوو پاشا گۆتی وەزیرانم کێتان بۆم کەشف دەکات، کە نهێنی ئەو بەچەدەروێشەی چییە؟ چ کارەیە، ناوی چییە، بۆچی هاتووە؟ (خەزەندی) وەزیر گۆتی پاشام خۆشبی ماوەی هەفتەکی (بەچە دروێش) بدە دەستە من دەیبەمە ماڵەوە هەمووشتەکی پێ ئاشکرا دەکەم... ئەوە بەچە دەروێش نیە پاشازادەیە... پاشا گۆتی باشە.

(خەزەند) دەروێشی لەگەرە خۆ بردەوە مارێ (خەزەند) کچەکی هەبوو یەکجار نازدارو جوان و شۆخو شەنگ بوو ناوی (گولچە هرە) بووکە بەچە دەروێشی دیت چووەپێش زۆر پرسیاری لێکردن بەچە درویش گۆتی ئیزنە جەنابی وەزیر ئەمنیش پرسیارەکی لە تویکەم؟... وەزیر گۆتی فەرموو. بەچە دەروێش جەنابی وەزیر ئەو حۆریە کێیە لێرە؟ وەزیر گۆتی ئەوە کچمە ناوی (گولچە هرەیە)، بەڵام لۆئەو پرسیارەت کرد؟ گۆتی هیچ... گۆتی دەروێش لە مەخسەدی تۆ گەیشتم... یەکسەر چوو مەلای هیناو کچی خۆی لێ مارە کرد شەوێ لە پاری کرد تاماوەی یەک هەفتە لە گەری بوو هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ (خەزەند) و (گولچە هرە) ی گێراوە لە سیری هەتا پیازی... پاشان بردیەوە دیوەخانێ پاشای... گۆتی پاشام خۆشبی دیارە بەچە دەروێشە هیچ کەلکی نیە لەگەر ئەوسەگبابەی باهەر قاوەچی بیت لەلای تووە بەچە درویش ماوە لەلای پاشای بە قاوەچی... (مەزهەر پاشا) کچەکی زۆر نازداری هەبوو ناوی

(رەیحانە) بوو... (رەیحانە) خورامەکی لە دیوە خانی بوو هەرچی رویدا بالە دیوە خانێ بە رۆژ بەشەوێ لۆریحانەی دەگێڕاوە... هێوارێ خورامەکە چوەوە (رەیحـانە) لێی پرسی... لەو رۆژانە لە دیوەخـانێ بابم چ هەیە؟... خـورام گـۆتی خـانم هیچ نیـە لەبەر باسی (بەچە دەروێشی)... خـانم گـۆتی (بەچە دەروێش) چیە؟ گۆتی (خواجە حەسەن) بەچە دەروێشەکی لەگەرە خۆی هینایە لەوسەفەرەی هەر دەرێی مانگە شەوقی دەداتە دیوەخانێ لاوی ئەوها لە دنیایێ کەس نەیدیتیە... گۆتی کێیە؟ چ کارەیە؟ گۆتی کەس نازانی هەر دەرێ (بەچە دەروێشم) گـۆتی باشـە چ دەکـالە دیوەخـان؟ گـۆتی قـاوەچیـە... گـۆتی زۆر چاکـە... شـەو درەنـگ داهات (رەیحـانە) چوودیتی وا (بەچە دەروێش) لە ژۆرەکەی خۆی دانشتیە... یەکسەر لیێ چوە ژوور... بەچە دەروێش هەرستاو دلێ راچەنی... گوتی فـەرمـوو ئاغـاژن... (رەیحـانە) گـۆتی ئەمن کـارەکـەری ئاغـاژنێـمـە ئاغـاژن لە مـارێـیە بەچە دەرەێش گـۆتی پەککو ئەگـەر کـارەکـەر ئەوهابی دەبی ئاغـاژن کوبی؟ فـەرموو دانیشـە... (رەیحانە) دانیـشت لەلای بەچە دەروێشی... گـۆتی نەوجەوان تۆو ئەو خوایەی کەدەیپـە رستی راستیت لەلای ئاغـانە گـوت، لەلای وەزیر نەگوت لەلای (حەسـەن توجـار) نەگـۆت... بەس لەلای من راسـتی برێ... شـەرتبێ لەسـەر چ دینەک بی دێـمـە سـەردینـی تو، دینی بابو باپیرم بەجێ دێرم بەس راسـتیم پێ بلێ... گـۆتی راسـتیم گـۆت ئەمن بەچە دەروێشم... گۆتی عـەیبە لۆ پاشازادان درۆ!... لەگـەڵ کـەسیش نا لەگـەڵ ژنان... ئەگـەر پیـاویش باقـەیدی نە دەکـرد دەمگوت دیارە لێم دەترسێ لۆیە ئاشکرا ناکـا... ئەگـەر ئەتو بەچە دەروێش بێ، یان پاڵەوان بی ئـەمن چم لەگەرە تۆ پێدەکرێ؟... شێرۆ گـۆتی خاتوون لۆنێر هەیە لەدونیـایێ ئەمن لێی بترسێم ئەگـەر پاشابی یان گـەدابی... خـاتوون من کـوڕە پاشامـە خـوا پەرستم ناوم (شازادە شێرۆیە) گۆتی کەواتە ئەمنیش کـچی (مەزهەر پاشا)ی ئێرانـیـمە ناوم (رەیحـانە)یە... ئەوە لـەسـەر دەسـتی تۆ ئـیـسـلام بووم هاتمە سـەردینـی تۆبەس لەگـەرم بێـوەفـانەبی!... گـۆتی خـانم ئەگـەر عـومـرم بمێنی شـەرت بێ لەشـەرتی مـەردان دەتهـێنم... ئەگـەر نەشـمـام ئەوە گلەیی مـەکـە... رەیحـانە مـاوەیەکی لەلای مـاوە پاشـان دوعـا خـوازی کـردو رۆیشت... مـاوەیەکی پێش هاتنی بەچە دەروێش کـوڕی مـامی رەیحـانەکـە لە مەملەکـەتەکی تر بوو هاتـبوە داخوازی ناوی (هۆشەنگ) بوو، بەڵام رەیحـانە پێی رازی نەبوو دەیگـوت شـوی

پێناکەم (مەزهەر شای) باوکیشی دەیگوت ئامۆزاتە دەبی شوی پێبکەی، کات بە سەرچوو هەر وەختەکی رەیحانە ویستبای شەو دەچووەلای بەچە دەروێش تادرەنگ گەمەو سوحبە تو رابواردنیان دەکرد دەروێشتەوە ژۆرێ خۆی ماوەک بەسەر ئەو بەزم ورەزمەی دارەتبوو رۆژەک دیتیان لە ناکاو چار دەوری شارگیرایە... هەتا چاو حوکم بکا خیوەت و بارە گاهەردرایە... بەیانی زوو قاسید هاتە دیوەخانی (مەزهەر پاشای) کاغەزی دایە دەست پاشای...ئەویش دایە دەستی وەزیر نامەیان خوێندەوە لیێ نووسرا بوو... بۆ پاشای ئێرانی (مەزهەر پاشا)ی بەرێز من کەناوم (فەخفورە کوری خاقانی چینم) بەخۆ بەلەشکرەکی زۆر هاتیمە داوای (رەیحانە)ی کچت دەکەم بۆ خۆم بە خۆشی یابە ناخۆشی... ئەگەر پێشکەشم دەکەی ئەوە مەمنونم ئەگەر ناخۆت ئامادەکە لۆشەڕ کە وەزیر نامەی خوێندنەوە هەموو مەجلیس داما... هەندەک گۆتیان پاشام خۆشبی پێشکەشی بکە بائەوشەڕو شۆڕەمان لە یەخەی ببیتەوە لەسەر کچەکی مەملەکەتمان باکاول نەکرێ... هەندەک گۆتیان نابی حەیامان دەچی کچمان بە زۆر لێبستێنن!... بەتایبەتی (هۆشەنگ) گۆتی پاشا بەیانی ئەمن بەخۆم دەچمە مەیدانێ بزانە چەند سەرت بۆ دەبڕم بەچە دەروێش هەر قاوەی دەکوتاو گێی دابووە قسەکانیان... پاشا گۆتی وەزیران ئیمە شەڕدەکەین زۆر عەیبە بۆ ئێمە لەترسی مندارەکی، کە لە شکری هینایە ناموسی خۆم تەسلیمی بکەین... گۆتیان پاشا کەیفی خۆتە... پاشا گۆتی وەزیر بنوسە: حەددی خۆیو بابو بابیری نەبی کچی بەزۆر بدەمێ سبەینێ لە مەیدانێ دەبی دەردەکی پێبکەین ناوی خۆی لە بیربکات... نامە تەواو بوو قاسد نامەی وەرگرت گەڕاوەلای (فەخفور)ی بەیانی لە شکرکۆ کراوە لە سەراسەری ئیرانێ تەپلی شەڕلێدرا بەناوی پالەوانەکی چینی ناوی (هۆشەنگ) بوو بەناوی (هۆشەنگی) برازای پاشا وەلام دراوە. (شێرۆ) لە دیوەخانی پاشای زۆر تەنگاو بوو دەیزانی ئەو شەڕەبەوی نەبی ناکرێ بۆیە چووە لای رەیحانەو گۆتی شەڕە ئەمن شیروتیرو ئەسپم نیە بە چ شەڕ بکەم لەگەر ئەو کافرانە... (رەیحانە) گۆتی (شیرۆ) بابم یەک ژۆری پڕی چەکو ئەسبابی شەڕی هەیە برۆ بابچین لۆخۆت هەر بژێرە کە چوونە ئەو هۆدەی دیتی هیچی تێدانەبوو بەکە لکەوی بێت... گۆتی خانم ئەوانە چەک وئەسبابی من نینە گۆتی (بەچە دەروێش) شیروتیرەک لە ژورێ بابم بەدارێوە کرایە ئەگەر ئەوت لۆ باش بوو

ڕات لێبو بیبه... کەچوونە ژووریّ بابی شیرەکەی دیت ڕەونەقان دەینی گۆتی ئەوشیرە باشە ئەدی ئەسپ چوونە تەویلەی هەر ئەسپە کی دەستی لە سەر پشتی دانا زگی گەیاندە عاردی گۆتی خانم ئەوانە ئەسپی من نین... گۆتی بەچە دەروێش جوانیەکی بەحریمان هەیە بابم چەندسارە لە ژۆرەکی تاریکی دابەستیە کەس نایگاتێ ئالیکی بداتی لە کولانکەی بانی ئالیکی دەدەنێ ئەگەر دەرێی بابچین بیبینین، بەڵام بەلاشە پشتی ناداتە کەس (شێرۆ) گۆتی (ڕەیحانە) ئەتو پیشاندەو حەقت نەبی کە چوون دەرکەوان دەرکەی کردەوە لە پشت هەفت دەرکاندا بوو هەتا بەچە دەروێش سێ دەرکەی کردەوە جوانیەکە کە چاری شکاندکە هەرستا سەردەستا نو لۆ شێرۆی هات (شێرۆ) ناوی خوای هێناو مستەکی لە تەختی نیوچاوانێ قایم کرد جوانی پاشەو پاش کشاوە هەتابنەبانێ لەوێ قونی لە عاردی دانا گۆڕگور ئاوی لە چاوان هاتە خوارێ... وەجواب هات ئەسپەکە گۆتی هەی دەستت شکێ لۆ ئەو مستەت لەمندا؟ گۆتی لۆسەری نادەی؟... گۆتی لەکاتی ئەمن خەلق کرایە لۆ شازادە (شێرۆی) کوڕی (برایم پاشای) دانرایە کوسەری دەدەمە تو؟ شێرۆ گۆتی ئەگەر قبولم کەی ئەمن شێرۆمە ئەسپ کە گوێی لەوقسەی بوو یەکسەر گێی بەخو دابەردانەوە. (شێرۆ) بژێ گرتن و لەبنە بانێی هینادەرێ کە ڕەیحانە چاوی بە ئەسپو شێرۆی کەت وەختبوو لە خۆشیان باربگری یەکسەر زینەکی مرواریان لێکردو شێرۆ نقابی ڕەشی لۆ خۆیو وراخی پۆشیو سواری ئەسپ بوو چووە ئەو سەری شاری کە لەمەیدانێ سوڕاوە دیتی ئەوە (هۆشەنگ) لەگەڵ (هۆشەنگ)ی چینی والەمەیدانێ جەولان دەکەن هەر شیعری بەرامبەر یەک دەخوێنن... ئەویش لەلای پشتەوە خۆی هاوێشتە مەیدانێ چووە بەینیان گۆتی کاکە لۆشەڕێ دەکەن بزانم شەڕەکەو لە سەرچییە؟ هۆشەنگی برازای پاشا گۆتی کاکە ئەوانە لە شکریان هینایتە سەرمە دەیانەوێ یان ڕەیحانەی ببەن یان مەملەکەتی ئێرانی کاو لبکەن ئەمەش نە (ڕەیحانە)ی دەدەین نە هیچ ئەگەر نەشکەڕێتەوە ئەوە لۆ (خاقانی چینێ) دەیانکەینە پیاو... (هۆشەنگی) چینی گۆتی ئەمە هاتینە ئەو کچەی لۆ کوڕی پاشای خۆ ببەین ئەگەر نەیدەن ئەوە بەشەڕ لێیان دەستینم (شێرۆ) نقابی پۆشیە کەس نایناسی گۆتی ئەمن لێنا گەڕێم ئەو شەڕە بکرێ ئەگەر ڕازی بن... گۆتیان ئەتو کێی؟ گۆتی ئەمن کوڕێ پاشای مەغریب زەمینم ئەوی شەڕی ڕانە گری ئەمن لێی دەدەم... پاشاو وەزیر خەرکی شاریش

هەموو لە دیار ئەو مەیدانەی راوەستاینە کەس نازانی مەسەلەچیە... ئەو سوارە نیقاپۆشە کێیە و لۆچ هاتیە؟ بەس (رەیحانە) دەزانی... هۆشەنگی چینیێ گۆتی ئەتوچی هەتا لە عالەمێ بدەی ئەگەر نەچیە دەرێ لە مەیدانێ سەری تۆش لە گەرەوان دەپەرینم... هۆشەنگی ئێرانیش گۆتی پاشا ئەتو چ بڕێی ئەمن رازیە. (هۆشەنگی) چینیێ گۆتی ئەمن رازی نیمە... نیقاپۆشی گۆتیە هۆشەنگی ئیرانی ئەتو بڕۆ پشتەوە تازە شەڕشەری منە... (هۆشەنگی) ئیرانی گەڕاوە دواوە لە مەیدانی (هۆشەنگی) چینی گۆتی پالەوان بە چ لیک بدەین... گۆتی کافر بەهەرچی قوەتت هەیە لێک دەدەین... هۆشەنگ گۆتی پالّەوان دیارە هەرزەکاری لەمەیدانی شەڕی شاردزانی لەبەر هەندێ درم نایێ بە گورزان لێت بدەم چونکە بەرگەی گورزەکی من ناگری... بۆیە دێمە خوارێ لە وراخی بەملان دەکەین... گۆتی کافر هەرچی قوەتت هەیە بەکاری بینە... کافر لەو راخی هاتە خوارێ... بەملان کە تنەبەر یەک لەسبەێنێ هەتا نوێژی نیوڕانی... لەکاتی نوێژی دەستیان لەیەک بەردا کەس زەفەری بەکەس نەبرد... (شێرۆ) لە مەیدانێ چووە دەرێ لە دەوروباری نوێژی کرد ئەگەر نانەک هەبوو خواردی کافریش لە جەمێ نیوڕانێ یەک کەلەشە بەرازی خواردپاش نانخواردن دیسان لۆیەکدی هاتنەوە مەیدانێ دەستیان بە زۆرانبازیێ کردەوەو هەتا نزیکی نوێژی عەسرێ... لەوەختی عەسرێ (شێرۆ) دەستی بەدوعایان کردو لە خوای پاڕاوە گۆتی خوایە فرسەتم بدەی بەسەر ئەو کافرەیدا زالّبم... (شێرۆ) ناوی خوای هێناو پێی راست و چە پکردن کافری لە عاردی کردوەو خستیە سەردەستی خۆی وەک مەزرەحی سوڕاندی کە لە عاردی دایەک مەترعەردی پێ قۆر کرد فەقەراتی پشتی شکاند هەندە بەتێن لە عاردیدا شمشیری هەرکێشاو یەکسەر سەری بڕی ددنگی دەستت خۆش لە هەموو لایەکی شاری هەرستا... هەتا ئەو سەینو بەینەی کرد هێوارە داهات تەپلی ئاسایش لێدراو لەشکر گەڕاوەبن خێمەی خۆی شێروش لە مەیدانێ چووە دەرێو لە پێش چاوان بزربوو لەولای شاری سوڕاوەو ئەسپی بردەوە تەویلەی بەخۆش گەڕاوە دیوەخانێ پاشای دەستی کردەوە بەقاوە کوتانێ هێشتا پاشاو وەزیر نەگەڕابوونەوە مارێ... هەموو خەرکی شاری سەریان سوڕمابوو لەو سوارە نقاپۆشەی کە کێبوو؟ چ کەس بوو؟ بۆشەڕی لەسەروان کرد؟ هوشەنگی چینی: کو ئەوهە بە ئازایەتی کوشت؟ لە دیوەخانێ هەرئەو باسە بوو

(شێرۆش) گێی لۆ ڕاگرتبوون... بەیانی کە رۆژ لە بورجی منەوەر هاتە دەریێ سەری چیایان زەردبوو بنیان رەنگاو رەنگبوو چێشتێ پارەوانان خورا تەپلی شەڕلێدرا بەناوی پاڵەوانەکی چینی کەبەناوی (ردقەمی پۆراکرۆژ) بەناوبانگ بوو... ئاسن و پورای وەک شەکرۆکەی ئەکرۆشت لێدرا لە لەشکری (مەزهەرشای) بەناوی (هۆشەنگی) جواب دراوە پاڵەوانی چینی هاتە مەیدانێ سواری پشتی فیلەکی ببوو ئاگر لە کونە لووتی دەهاتە دەرێ... هۆشەنگیش سواری ئەسپی خۆی بوو دەستی دایە گورزی (شێرۆ) لەلای دی سوراوە چوو ئەسپی لە تەویلەی دەرێناو نقابی خۆبو ئەسپی پۆشی لەلای دی لە مەیدانێ هاتە دەرێ کەدیتی ئەوە هۆشەنگ لەبەرامبەری پاڵەوانی چینی راوەستایە... کە بە دەرکەوت هۆشەنگی هەناسەیەکی درێژی هەرکێشا گۆتی خوایە زۆر شوکور لەوەش دەربازبووم نیقاپۆش هات گۆتی چیە ئەوە لۆشەڕی دەکەن؟ هۆشنگ گۆتی ئەوە لەشکریان هینایە دەیانەوێ رەیحانەی کیژی پاشای ببەن نیقاپۆش گۆتی ئەمن غەدری قبوڵ ناکەم ئەگەر رازی بن. ئەوەی رازیش نیە دەبی شەڕی لە گەرە من بکات هۆشەنگ گۆتی ئەمن بەقسەی تو رازیە (ردقەمی پۆراکرۆژ) گۆتی منداری سەبی ساوا کێروشکە بەشکەی بەشیری خاو گەورە بووی ئەمن هەرجارەکی بەقەدەر کە لەشی تۆ پۆرای دەکرۆژم ئە تو چی هەتا رازی بی یارازی نەبی... نیقاپۆشی گۆتی کافر گوبخۆ ئیستا لە مەیدانێ چارەت دەکەم شەڕ شەڕی پاڵەوانا نە کافر بە چ شەڕ بکەین؟ کافر گۆتی بەهەرشتەکی لیت بدەم حەیاتت بە بادەدەم وەرەکوڕی چاکبەو لەزین دابەزە ئاوزنگم ماچکەو سەجدە لۆبتی گەورەببە لەدیوەخانێ (خاقانی چینێ) دەتکەمە قاوەچی، خۆت بەدەستی من مەفەوتێنە... (شێرۆ) گۆتی کافربتی گەورە چیەوەرە ئەتو سەجدە لۆئەو خوایەی ببە، کە ئەتۆو ئەمن ودونیاو مافیهای دروست کردیە بتی گەورە چیە کە بەدەستی بەشەر دروست کرایە کافر گۆتی لۆ لەبتی گەورەش گەورەتر هەیە خوا چیە؟ (شێرۆ) گۆتی کافر خوایە کەو بێ شەریکەو هەمووشتەکی دروست کردیە... کافر گۆتی ئەگەر وایە خوای تۆ راستە ئەو گورزەی ئەمن لیت دەدەم باخوایەکەت نەجاتت بدات... شێروش گۆتی کافر گورزی خۆت بوەشینە ئینجا گورزەی پاڵەوانان دەبینی... کافر گورزی سەد باتمانی کردە حەلقە لە دەستی کەبرندی کرد لۆ عاسمانێ وەک کورەی حەدادان گوڕیە ئاگری لێدەباری... شێرۆ مەتاری خستە سەرسەری

دەستی کردنە کۆلەکە لەبن مەتاری کە کافر دووسەران هاتوو چووگورزی گرانی
فەرقی سەری شێروی کرد ئەو شیرەی بەمنداری خواردبووی لەبن کونەلوتی
هاتەدەرێ ئەگەر خوای تاکو تەنیا نەیپاراستبا حەیاتی لەبەر بڕابوو... بە زۆر
ئەسپی تەکانداو لەناو خۆرولی هاتە دەرێ دونیا بووە تەپو تۆز یەکسەر
نۆشداروی دەریناو خستیە بن کونە کە پوی بە زوویی چاکبوە وەو لەسەری
مەیدانێ هاتو چووکە دیتی وا کافر لە فیلی دابەزیە لە پارچە گۆشتەکی
دەگەڕێ بیخاتە بن کلۆرایێ ددانی (شێرۆ) سەرە ڕمەکی گەیاندە قونێ...
هاکافر ئەوە لە چ دەگەڕێی؟ گۆتی توخوا پاڵەوان ئەتومای؟ گۆتی مەلعون
تیرۆکی داکم بەمنداری لەسەری دەدام لە گورزی تو گرانتر بوو کافر دەمارەکی
لە قونێ پسا... گۆتی پاڵەوان گورزەی خۆت بوەشێنە هەتا هەنکە پاڵەوان
نەبووە لە بەرگورزی من سەری برندبکا دیارە هەجە لم بەدەستی تو هاتیە...
شیرۆ گۆتی مەلعون جیهان جاموفەلەک ساقیو ئەجەل نەی خەلاس ئبادەی
مەرگت بەدەستی شێرۆی هات مەلعون جامی شەرابی مەرگت لە دەستم وەرگرە
کەشێرۆ گورزی برند کرد بۆ عاسمانێ دوو جار لە مەیدانێ هاتو چوو لەگەر
هاواری ئەڵلاهو ئەکبەر گورزی لەسەری کافریدا... کافربە فیل و مانگە نۆ
سەوەکەتە سەرخاکو حەیاتی لەبەر بڕا ئەوەندە بەڕق لێیدا دەنگی دەستت خۆش
لە مەیدانێ بەرزبوەوە... دیسان شەڕ راوەستاوە لەشکری چینی گەڕاودبن
خێمەو بارەگای خۆی شازادە شێرۆش لەوسەری مەیدانێ لۆی دەرچوو وراخی
بردەوە تەویلەی گەڕاوە دیوەخانێ دەستی بە قاوە کوتانی کردەوە. پاشاو وەزیر
بەسوحبەت و سەیران هێواش هێواش بەرەو دیوەخانێ گەڕانەوە. سەریان لەو
بەزمەی سوڕمابوو دەبێ ئەوسوارە نقاپوشەکێ بێ ئەوە دوو ڕوژە لەمەیدانی لە
جیاتی ئەوان شەڕدەکا... لەشکری چینیش کە گەڕانەوە (فەخفور) کورێ
(خاقانی) چینی بە خۆی سەر لەشکر بوو بەلە شکری خۆی ڕاگەیاند ئەمن
چیدی شەڕ بەکەس ناکەم، کەسی دی بەکوشتن نادەم ئەمن بەیانی بەخۆم دەچمە
مەیدانێ ئەگەر ئەمن کوژرام ئەنگوشەو فرار بکەن و بڕۆنەوە... ئەگەر
سەرکەوتوش بووم ئەوە بەردەوام دەبم لە شەڕ هەتا رەیحانەی وەدەست دێنم...
بەیانی تەپلی شەڕ لێدرا بەناوی (فەخفوری) کوری خاقانی چینێ بەناوی
هۆشەنگی وەلام دراوە... (فەخفور) دەستی دایە گورزی گران شیری حەمایلدا
تیروکەوانی بەخۆوە کردن چەند دەسکە گوری لەبەر کراوی ناخەنجەری جەو

هەرداری لەبەر پشتێ راکرد تەسبیحی شووشەی لەخەنجەرێ ئاراندکە هاتە میدانێ نازی لەسەر عاردی دەکردن... لەوسەری مەیدانیش هۆشنگ هاتە دەرێ. کە چاوی بە فەخفوری کەوت دەستبەجێ دەستی بەمناجاتێ کرد خودایە بۆ خاتری خۆشەویستانت نقاب رەشم لۆ بنێریەوە ئەگەر نارۆژی پێچووبم ئەو رۆیە... کە گەیشتە لای فەخفوری سەببا خێری لێکرد ئەویش وەڵامیداوە (فەخفور) زۆر مەغرور بوو گۆتی ئەی هەرزەکار برۆ لۆ خۆت لە ناو منداران کەلایانێ بکە ئەوە مەیدانێ پاڵەوانانە، گورزی من نابی وەسەری تو بکەوی هەتا نیقاپۆشی نەکوژم ئینجا خاکتان لە تورەکان ددکەم دەبیەمە وڵاتان پەرت و براوی دەکەم... لە ناکاو نقاپۆشی لێ پەیدا بوو سەلامی لێکرد وەڵامیان داوەو گۆتی نابی ئەوشەڕە بکرێ (فەخفور) گۆتی لە عاسمانانم ئەخواستی لە عاردم کەتیە بەردەستی دوو رۆژە دوو پاڵەوانی نەقەنەقەی منت کوشتیە نقابت لادە بزانم ئەتو کێی؟ چ کەس نەبووە یەخەی لە شکری چینی بەتایبەتی (فەخفوری) کورێ (خاقانی) چینی بگری نیقاپۆش گۆتی کافر لەزینی دابەزە وەرە سوجدە لۆئەو خوایەی ببە کەدونیاو قیامەتی دروست کردیە، کە ئەو هێزو قوەتەی دایتەتو... (فەخوری) گۆتی خوا چیە؟ لۆکەس لە بتی گەورە بەتواناو بەدەسەلاتتر هەیە؟ (نیقاپۆش) گۆتی کافر خوا یەکەو بێ شەریکەو تاکو تەنیایە نە لەکەس بووەو نەکەسی لێدەبێ بتی گەورە چیە کە لەبەرد دروست کرایە (فەخفور) بە حەقی ئەو خوایەی کە ئەیپەرستی ئەگەر نیقابیشت لانادەی ناوی خۆتم پێبلێ بزانم ناو بانگت هەیە یانا... ئەگەر ناو بانگت نەبی ئەمن شەڕت لەگەر ناکەم... نقابپۆش گۆتی ناوم (شیرۆ)یە کورێ (برایم) پاشای رۆمێمە برای شازادە (ئەرچە)ی... (فەخفور) گۆتی ئەدی چ دەکەی لێرە؟ لۆ چ هاتی؟ گۆتی وەکی تو هاتیمە (رەیحانەی) ببەم. لەشکری تو دەشکێنم پاشان لەشکری (مەزهەر) شاش دەشکێنم ئەگەر (رەیحانە)ی نەدا... (فەخفور) گۆتی لە رملو نجومانم دیتیە کورەک لە رۆمی پەیدا دەبی دەبیتە ئقلیم گیر کەواتە ئەتوی... وەرەبا وەک برادەست لە ناودەست... باشەرۆ دەعوای لەگەر یەک نەکەین پە نابەخوای لە شکری هەموو جیهان دەشکێنین... هەرکەس لەسەردینی خۆی (شێرۆ) گۆتی واز لەقسەی پروپوچ بینە ئەورۆ جامی شەرابی مەرگت پێدە نۆشم بەس بەوەی وازت لێدێنم برێی خوایەکەو بێ شەریکە هیچ شەریکی نییە... فەخفور گۆتی لۆ من زۆر عەیبە

ئەمن کوڕی خاقانی چینێ بم هاتبم ڕەیحانەی بەزۆری. لە (مەزهەر) شای ئێرانی بستینم خاوەنی هەزاران سواربم لێرە لەمەیدانی لە بەرە تو ئیسلام ببم یان تەسلیمی توبم... شەر کردنەکە مەسلەحەت ترە بە چ شەڕ بکەین؟ (شێرۆ) گۆتی دەستی یەکەم ئی کافرانە بەچیت مەخسەدە بەوی دەکەین... گۆتی بە گورزان دەکەین... شێرۆ گۆتی بە گورزان بە گورزان...فەرموو گورزی خۆت بوەشینە (فەخفور) گۆتی (شێرۆ) دەستم ناڕوا گورزی سەدباتمانی لەسەرت بدەم... شێرۆ گۆتی کافر لافوگەزافی پیناوێ گۆرزت بوەشینە... کافر لە مەیدانی سێ سەران هاتو چوو گورزی سەدباتمانی بەرز کردەوە شێرۆش مەتاری لەسەرسەری داناکە کافر گورزی لە عاسمانێ سوڕاند گورزی وەک گوجیلەسەی لە عاسمانێ نورە نوری دەهات کە گورزی حەوارەی سەرێ شێرۆی کرد مەلایکەتی عاسمانێ هاواریان کرد خوایە بیپارێزە دونیا بوو بە تۆزوغوبار کافر هەندە بەزەبری گورز راوەشاند... شێرۆ مەتاری دەملانکەت... شیرێ بەمنداری خوارد بوو لە کونە تفنکانی هاتە دەرێ وەختبوو رۆحی شیرین تەسلیم بکا ئەگەر خوا نەیپاراستبا تەواو ببولە ناکاو لە ناوتە پو تۆزی دەریەڕی هاتە دەرێ... فەخفوریش چاوە ڕوانبوو ئەگەر سێ سەران بێوبچی سەری برندنە کا ئەوەسەری دەبڕی کەدیتی شێرۆ هەرستاوەسێ دەماری لە لەشی پسان. شێرۆ گۆتی کافر نۆبەمە... (فەخفور) گۆتی (شیرۆ) ماوی؟ گۆتی کافر لۆ ئەوە گورز بوو لە منتدایان بێرە خۆرەکت بەسەر سەری داکردم؟ (فەخفور) گۆتی شێرۆ گورزی خۆت بوەشینە...(شیرۆ) دوو سەران لە مەیدانێ هاتو چوو گورزی برندکردە ئاسمانیو خێواندیە سەرێ فەخفوری- ئەسپی لە خۆربدا چەقی هەر چەندی لە ئەسپی خوڕی لە خۆری نەهاتە دەرێ ئاخری فەخفور پیادەبوو گۆتی شێرۆ نەمزانی هەر ئەوەندە قوەتت هەیە ئێستاش ئەمن پیادەمە شێرۆ گۆتی ئەمنیش ئەبە پیادە... خۆی لەسەرپشتێ وراخی فڕەدا گۆتی فەخفور بە چ بکەین گۆتی بەکەمەندان هەریەکی هەشتا کەمەندی لەیەک گیر کرد کەقوتیان دایێ هەر هەشتای پارچەپارچە بوو گۆتی بە چ بکەین گۆتی بەملان... هەر لەوکاتی هەتا نزیکی نوێژێ عەسرێ چەندجێیان لەبەر ئارەقەی گواستەوە چونکە دەبووەقوڕ، نزیکی عەسرێ (شیرۆ) ناوی خوای هیناو پێی راستی بردە پێش، پێی چەپی چەقاند (فەخفور)ی ڕاکێشا لەعەردی کردەوە برندی کرد لۆ عاسمانێ خستیە سەردەستی خۆو سوڕاندی لەسەر دەستان لە

ناوەندێ مەیدانێ هەندە بەقوەتی لە عەردیدا یەک گەزی عارد پێ قۆلکرد هەرماسی هەر کێشا سەری ببڕی دیتی (فەخفور) ئەگرێ... شیرۆ گۆتی زۆر عەیبە لۆ پالەوانان لە ترسی مردنێ بگرێیت... گۆتی بەخوای لە ترسێ مردنێ ناگرێیم بەس فرمێسکی غەریبیم دێنە خوارێ ئەمن لۆ رەیحانەی هاتیمە هەنکەش بە نامرادی ئەمرم... شێرۆ گۆتی هەنکەش ببە ئیسلام ناتکوژم رەیحانەشت لۆدەینم... فەخفور گۆتی عەیبە لۆ من عالەم ئەرێ لەو پالەوانەی پاراوە هەتا عەفوی کرد نەیکوشت قەت ناپارێمەوە سوکیش نایێمە سەر (خاقانی چینی) شیرۆ هەر ماسی هەر کێشاو لەبنی زگیدا هەریدڕی دەنگی دەستت خۆش لە عاسمانێ شاری بەرزبووەوە شەڕبەتار بوو هەرکەس گەڕاوە جێومەکانی خۆی شەوێ لەشکری چینێ بێسەردار فراریان کرد هەمووی هەرات لۆمەملەکەتێ خۆی گەڕاوە (شێرۆ) بووە بەچە دەروێشی جاران، دەستی کردەوە بەقاوە چیاتی... شەوێ (رەیحانە) هاتو بردیە ژوورێ خۆی لەوێ دەستیان بەسوحبەتو دەستبازی کرد خەویان لێکەوت- (هۆشەنگ) شەوێ گۆتی باسەردانی رەیحانەی بکەم ماوە کە نەمدیتیە کە چووە ژوورێ دیتی بەچە دەرویش والەکن رەیحانەی خەوی لێکەتیە شیری هەرکێشاو هەتا قوەتی هەبوو لەتەوقی سەری شێرۆی داوگە ڕاوە. (رەیحانە) لەگەر دەنگی دەرکەی بەخەبەر هات کەدیتی شێرۆ فرقەی خینی لەسەری دێ یەکسەر هەندەک داو دەرمانی خستە سەرسینگی بەخورامان سندوقەکەی بردە ناوەندی مەیدانێ شاری داناو گەڕاوە... (زیادی دز) هەبوو بە خۆو بەچل دزی لە چیای ئەژیان شەوێش دەهاتە ناو شاری... بەکاری خوای رێێ کەتە ئەو شوێنەی کەدیتی سندوقەک لەوێ داندرایە بەجەماعەتی گۆت بزانن چیە؟ کە لەسەریان هەرداوە دیتیان کە لەشەکی تێدایەو کیسە پارەکی لەسەر داندرایە دزەکان گۆتیان پارەکەی زۆرە با بەشی بکەین (زیاد) گۆتی نەفامینە ئەوە لۆدابەش کردنێ نییە ئەوە کرێی ئەو کەسەیە ئەو مەیتەی چاک بکاتەوە گۆتیان ئەدی چ بکەین؟ ئەمە سندوقەکەی دەبەینە لای خۆ دوو کەس برۆن دختۆرەک لە فلان گەڕەکی هەیەناوی (ئاقۆ جووە) لەگەرەخۆی بینن ئەگەر هەر نەهات پارەی پیشان بدەن لە تەماعی پارەی دێتن... (زیاد) لەگەر جەماعەتی سندوقەکەیان لە شاری بردەدەرێ لۆ ئەشکەفتێ. دوو کەسەکەش چونە دوای دختۆری (ئاقۆجوو) گۆتی نایەم بە شەوێ. گۆتیان برایەکی عەزیزمان بریندارە دەبێ هەربێی ئەو کیسە پارەشت

دەدەنیێ کە (ئاقۆجوو) چاوی بەکیسە پارەی کەت یەکسەر پێراوی دەپێی کردنو دەستی گەیاندە جانتای کە لوپەلیو بە دوایان کەت، لەو گەڕەکی لۆ ئەوی دی لەوی لۆوێ هەتا لەشاری چونە دەرێ گۆتی نایەم... شمشیریان لەسەرسەری دانا ناچاروەپێشیان کەت هەتا چونە ئەشکەفتی لەوێ (زیاد) هەرستا گۆتی برایەکن بریندارە دەمەوێ چاکی بکەیەوە بەماوەیەکی کەم دختۆر گۆتی بەدوو مانگان چاکی دەکەمەوە... (زیاد) شیری دەرینا گۆتی کافر دوو مانگ زۆرە دەتکوژم دختۆر گۆتی بەمانگەکی دیسان گۆتی زۆرە گۆتی کاکە بەدوو هەفتان بەشەرتەکی ئەوکیسە پارەم هەموو بدەنێ گۆتی کافر پارە هەر لۆتوە دەست پێکە دختۆر خەریکی برینی شیرۆی بوو بەماوەی دوو هەفتان شێرۆ وەخۆ هاتەوە... سەری سوڕ ماکە چاوی هەرێنا ئەوانەکێنە؟ کەسی نەناسی زیاد وەقسەهات گۆتی کاکە ئەتوکێی؟ چ کارەی؟ لۆ بریندار... بووی؟ لۆلەناو سندوقیان دانا بووی... شێرۆ گۆتی کاکە ئەمن دەروێشم بەخۆشم نازانم لۆ لێرەمە... (زیاد) گۆتی قەسەم بەوخوایە کە دەیپەرستم ئەگەر دەرویێش بی ئێستا سەرت پەلدەدەم ئەگەر راستی نەرێی ئەمە ئیسلامین هەمومان ئەتوش چی راستە برێ... گۆتی کاکە ئەمن شازادەمە ناوم شیرۆیە کوڕی (برایم پاشای) یەمەنێمە... زیاد گۆتی ئەمن ئەتوم چاک کردەوە ئەتوش دەبی ئیشەکی لۆمن بکەی... شێرۆ گۆتی هەر ئیشەکی هەبێ بەچاوان، بڕۆ ئەمری عەفوم لە (محەمەد پاشا)... شامێ لۆبینە ئەمن خەرکی شامم لە شامێ تاوانبارم دەبێ قرارێ عەفوم لەوێ لۆبینی مۆر کرابێ بەمۆری (محەمەد پاشای) بەس زۆر بێوبژدانە ئاگادار بە دەتکوژی... کچەکیشی هەیە چەند برێی پاڵەوانە ئەگەر کچەکەت بەزاند ئەوە هەرچی برێی دەبی ئەگەرنا دەتکوژی... گۆتی باشە سبەێنی سەبر سەبر لە چیای هاتە خوارێ بەدزی خۆی گەیاندە رەیحانە سەرگوزە شتەی لۆگێراوە گۆتی ئەمن دەڕۆم لۆ شامێ ئەسپیش دەبەم ئەگەر گەڕامەوە دەتهینم هەر لەسەر قسەی خۆمم ئەگەر نەگەڕامە وەگەردنم ئازادبکە چونەلای تەویلەی ئەسپیان هینادەرێ نیقاپۆش، سواری ئەسپی بوو دوعا خوازی لە رەیحانەی کردو رۆیی چەند شەوو چەند مانگان رۆیی تاداخل بە حدودی شامێ بوو لەوێ لە رۆخەکی شاری چووەمارێ پیرە ژنەکی چەنگە زێرەکی لەدەستی پیرەژنێ کردپیرەژن دیزەو گۆزەی پێکدادان... یەک ژۆری هەبوو ئەویشی لۆ شێرۆی چۆڵکرد شێرۆ دانیشت لەمارێ پیرەژنێ

گۆتی داپیره مێوانم رێم کەوتیتە ئێرە پیرەژن گۆتی کورِم کو جێ لە مێوانان تەنگ دەبی مێوانی لەسەرسەرو لەسەرچاوم گۆتی داپیرە ئەمن هاتیمە مەیدانداریێ (سیمو لعوزارێ) کیژێ (محەمەد) پاشای شامێ پیرەژن گۆتی کورِم بە قوربانت بم وازلەو عفریتە بیینە بەخوای سەدانی وەک تۆی کوشتیە رەحمەکی بە جوانیێ خۆت بکە... گۆتی داپیرە سەرەکم هینایەو نایگێرمەوە ئەگەر لەمەیدانێ سەریشم ببرِی دەبی هەربچم پیرەژن گۆتی کورِم مەچو گۆتی داپیرە عادەتەکەم پێبرێ خەرک بە چ شێوەکی دەچنە مەیدانێ ئەمن هەردەچم... پیرەژن گۆتی کورِم مادام هەر دەچی برۆ ئەسپت لەسەری مەیدانێ ببەستەوە ئەو قەسرە سپیەی لە تەنیشت مەیدانێیە ئەوە قەسری خانمێیە کەدێتی لەمەیدانێ ئەسپت بەستیتەوە، یەکسەر دەزانی پاڵەوانی بۆ وی هاتی، بەیانی دوو رکات نویژی کردوناوی خوای هیناو شوکرانەی خوای کرد، چێشتی بەیانی خواردو دوعا خوازی لە پیرەژنێ کردو سواری وراخی بوو چوو لەسەری مەیدانێ ئەسپی بەستەوەو رمی لەمەیدانێ چەقاندو راوەستاکە (سیمو لعوزار) سەری لە پەنجە رەی قەسرێ دەرینادیتی ئەسپەکی زۆر جوان لە مەیدانێ بە سترایتەوە کەتەماشای ئەو سەری مەیدانییێ کرددیتی نەوجەوانەک راوەستایە هەردەرێ (رۆستەمی زاڵە) لە مەیدانێ غەزریە زۆر لێی ترسا بانگی خوارمانی کرد گۆتی برۆن بزانن ئەو سوارە چیەو چ کارەیە ناوو ناو بانگی چیە؟ کەچونە لای لێیان پرسی پاڵەوانان ناو وناو بانگی چیە لە کوێ هاتی؟ گۆتی ئەمن کورِێ پاشای مەغریب زەمینێمە هاتیمە (سیمو لعزارێ) لۆبرایەکی خۆم ببەم ئەگەر نامەملەکەتی شامێ وێران دەکەم خاکی دەتورە گان دەکەم هەر مەملەکەتەکی تورەکەکی لێ فرێدەدەم کەخورامان گێ لەو قسەی بوو گەرِانەوە بە خانمێیان گۆت... گۆتی راستی نەگۆتیە پاشای مەغریب زەمێنی چ کۆرِی ئەوها سوار چاکی نینە دەعوای مەیدانداریێ لەمن بکا ئەمن لەو سوارەی زۆر ئەترسێم، بەلام پەنا بەخوای گەورە... خەبەریاندا پاشای کە پاشاو وەزیر ئەو خەبەرەیان بیست هەرستان لە دیوانێ بەرەو مەیدانێ شاری کەتنەرِێ بانگیان راهێشت لە هەموو مەملەکەتی کە پاڵەوانەک هاتیە دەعوای (سیمو لعوزارێ) دەکا هەمرو عالەم دەبێ بێتە مەیدانێ لۆهاندانێ (سیمو لعوزاری) هەتالێی بباتەوە کورسیو مێز لەدەوری مەیدانێ رێزکران پاشاو وەزیر هەموو دانیشتن خەرکەکە بەرەو مەیدانێ شاری کشا خانمیش بەلەنجە

ولارهەرستا چووە ژۆرێ خۆی گۆری جلکێ شەڕی لەبەر کردن شیری حەمایلدا دەستی داگورزی سواری ئەسپی بوو بەرەو مەیدانێ کشا خۆی نقابپوش کرد کە هاتەوە مەیدانێ لەهەر چوار دەوری گولبارانیان کردبووە چەپلە ریزان کە نزیک بودوە دیتی نەوجەوانەک وا لە مەیدانێیە لەوەی رۆژگار رۆژگارە جوانی ئەو های بەخۆوە نەدیتیە بەلایقی خۆی زانی لە درێ خۆی گۆتی ئەگەر بڕەک بەغیرە تو بەجەرگ بی ئەوە دەیکەمە هاوسەری خۆم. کەلێی چووە پێش سەباخێری لێکرد شێرۆ وەلامی داوە... خانم گۆتی نەوجەوان زۆر عەیبە لۆ پالەوانان درۆ ئەمن ناردم لۆ ناو ونیشانت بەداخەوە جوابت بەدرۆدامەوە لە مەملەکەتی مەغریب زەمێنی پالەوان نیە لۆمن بێتە مەیدانێ، دەعوای مەیداندارێ لەمن بکا شێرۆ گۆتی ئەتو زۆر مەغروری وەرە دابەزە ئاوزنگم ماچکە هەتا لۆ برایێ خۆت ببەمە مەغریب زەمێنی... (سیمو لعوزار) گۆتی پوچو ناماقولت کرد رەحمەکی بەجوانی خۆت بکە هەرزەکاری وەکی تۆ بەرگەی شیروتیرو گورزی پالەوانان ناگرێ لەو ماوەی کە ئەمن پالەوانبازێتی دەکەم هەتا نزیکەی هەشتاکەسم سەربڕیە ئەتوش هەشتاویەکی... (شیرۆ) گۆتی شەرتبی دەبی مەملەکەتت لێ تێک بدەم بە ئەسیر بتبەمە مەملەکەتان، بەلام هەندەی ناوێ دەستی یەکەم دەدەمە تو چونکە ئەتو بەرگەی گورزی من ناگری (سیمو لعوزار) گۆتی ئەگەر قبولکەی دەستی یەکەم دەدەمە تۆ بزانم قوەتت چەندە؟ (شێرۆ) گۆتی هادەستم بگرە بزانم قوەتت چیە؟ کە دەستی هاویشتە ناو دەستی (سیمو لعوزاری) گوشی لە بن هەر پێنج ئەنگوستانی خێن بە جۆگەلە دەرپەڕی بەلام نەیگوت ئۆف کەئەویش دەستی ئەوی گوشی هەروەکی دەستی شێرۆی خینی لە ئەنگوستان هینا خانم زۆر دری لۆشێرۆی نەرمبوو... (سیمو لعوزارێ) گۆتی پالەوان بەگورزان ناکەین بە شیرانیش ناکەین بەس بەقوەت زۆرانیازێ ئەکەین کێ کیێ لە عاردی داباسەری ببڕی... شێرۆ گۆتی بە هەرچی برێی ئامادە مەکە سینگیان لە سینگی یەکدیدا بوو بە رەعدو بەرق تۆزوغوبار ئاسمانی داپۆشی کەدونیا رووناک بوەوە دیسان ملی یەکدیان گرتەوە... هەتا هێوارێ خەریکی یەکدی بوون... هێوارێ (سیمو لعوزار) لۆقەسرو قسورێ گەڕاوە شازادە (شیرۆ) شی لەگەرە خۆی برد، هەرچەند گۆتی ئەمن ماری خۆم هەیە نابمە میوانی تو (سیمو لعوزار) رازی نەبوو لەتەنیشتە خۆی غورفەی بۆ رازاندەوە پاش نانخواردن شەوێش هەتا درەنگ دامەوسەر ترنجانەیان کرد

پاشان لێی نووستن کە ڕۆژ لە بورجی منودوەر هاتە دەرێ بولبولی ئاسا خوێندی
چێشتی پاڵەوانان خوورادیسان لۆیەکدی چوونەوە مەیدانێ هەتا هێواری
بەهەمان شێوە بەیەکوە هەر ژانەوە ئیتر ماوەی حەفت ڕۆژان بە یەکدیوە خەریک
بوون ڕۆژی هەفتەم دانی هێواری شێرۆ زۆر هیلاک بوو لەدەست سیمو لعوزارێ
ئەویش ماندوو ببوو، بەڵام لە شێرۆی باشتر بووکە دیتی شیرۆ زۆر هیلاکە لە
دەستی بەخۆشی قراری دابوو کە ئەوە گەیشتە هاوسەری خۆی دەبی شێرۆ هەر
بۆویبی ودختی بانگی عەسرێ شیرۆ دەستی بەمناجاتێ کرد (سیمو
لعوزاریش) خوادری نەرمکرد قراری دالەو هەنگاوەی دادێ خۆی بە دۆڕاندن
بدالۆ خاتری شێرۆی شێروش قوەتی دابەرە خۆی لەوسەری مەیدانێ پێی
ڕاستی ودپێش پێی چەپ خست ناوی خوای هینا دەگەر یاالله‌ی برندی کردەوە
لە عاردی و لەسەر ددستی خۆی سوڕاند هینای لە ناوەندی مەیدانێ لە
عاردیدا هەریکێشا هەرماسی نقابی دڕاند جۆتە مەمکەکی سپی وەک کافوری
وە دەرکەوتن (شێرۆ) زۆر شەرمی لەخۆی کردەوە ڕوی خۆی وەرگێڕا (سیمو
لعوزار) گۆتی وەرە بلندمکەوە بەو خوایەی کە ئەمنو توی دروست کردیە
کەچاوم بەتۆ کەتیە ئەمن قرارم دایە ئەگەر کەمەک غیرەتی هەبی، پاڵەوانبی
ئەوە خواهاوسەری بۆم نارد ماودی هەفت ڕۆژان مقاوەمەتت کرد هەتا هەنوکە
پاڵەوان نەبود دوو ڕۆژ بەرگەی من بگری بەخوای ئەگەر خوادری نەرم نەکردبام
لۆ تۆسێ مانگی توانای زۆرانبازیم هەبرو دەگەرە توسەریشم دەبڕی، بەڵام
هەرمسێنەرە تازە ماردبیم لەتوهات شیرۆ هەرێستاندەوە دەست لە ناو دەست
لە مەیدانێ بەرەو قەسرێ (سیمو لعوزارێ) ئەڕانەوە کەپاشاو وەزیر ئەو
بەزمەیان دیت ئەوانیش گەڕانەوە دیوە خانێ (سیمو لعوزار) لە دوای بابێ
خۆی نارد مەلایان هیناکە لە شێرۆی مارەبکەن (شێرۆ) گۆتی قەیدی ناکا،
بەڵام ئەمن لۆشەرتەکی دی هاتیمە لای پاشای لێرە توشی شەڕی بویمە... پاشا
گۆتی پاڵەوان تازە هەرچی دەعوا بکەی بە چاوان گۆتی دەمەوێ وەردقەی
عەفوم لۆزیادی لۆبکەی مۆری بکەی بە مۆری خۆت چونکە (زیاد) چاکەی
لەگەرە من کردیەو لەمردنێ ڕزگاری کردیە پاشا گۆتی بە خوای ئەتو نەبای
هەتابەرە بابی (محەمەد پاشای لە سەر تەختی شامێ بانە (زیاد) ئەو
مەملەکەتەی لێ حەرامبوو، بەڵام ئەوەش وەردقەی عەفوی ئەوەش مۆری من
(شێرۆ) (سیمو لعوزاری) لە خۆ مارەکرد شەوێ لەگەر یبوو ماوەک لەوێ ماوە

رۆژەک قاسیدو زیادو جەماعەتی گەڕانەوە (زیاد) گوتی شازادە شیرۆ (خاقانی چینی) لە شکری کردەسەر (مەزهەر) شای ئێرانێ هەموو مەملکەکەتی کاو لکرد (رەیحانەشی) بە ئەسیری بردە ولاتی چینێ... (شێرۆ) یەکسەر خۆی حازر کرد سورای ئەسپ بوو دوعا خوازی لە پاشاو جماعەتی کرد چووە لای (سیمو لعوزاری) گوتی وا حاملەی ئەگەر کوڕ بوو ناوی (جهانگیر)ی لێ دەنێی ئەگەر کچیش بوو کەیفی خۆتە لەولاش بەژنی یەکەمی گوتبوو کە (گولچە هرە)ی کیژی (خەزەندی) وەزیر بوو ئەگەر کوڕی بوو ناوی (جهانبەخشی) لێ دەنێ لێی دارۆیشت بەرەو وولاتی چینێ پاش سێ مانگ رۆیشتن چەند شەڕو شۆڕی کردن چەند شارو مەملەکەتی وێرانکرد هەتا گەیشتە شورای چینێ لەوێ لە لایەکی داخلی ولاتی چینێ بوو (خاقانی چینێ) لە نجومداران زانیبووی کە (شازادە شێرۆ) بەتاقە سوارە دێتە ولاتی چینێ لە دوای رەیحانەی لە هەر دەرکەکی لە ملەکەتی هەزاران پالەوانی دانا بوو شێرۆش چووە چایخانەکی لەسەر زینێ بوو هێواران زۆر قەرەبارغ بوو لە چایچیە کەی پرسی کاکە فلان تاریخی خاقانی چینێ لە شکری کردە سەر ئیرانێ (رەیحانە)ی بە ئەسیر هینا کابرای چایچی دەستی بەدەوی شێرۆی وەنا گوتی لەکێ دەخەوی؟ گوتی لەولای. گوتی ئەوشەو وەرە لای من هەمووشتت لۆ باسدەکەم. شەو شێرۆ چوە لای چایچی گوتی کاکە ئەتو چ ئیشت بەو مەسەلەی هەیە گوتی هیچ بەس دەمەوێ بزانم (رەیحانە) لەکێ سجنە؟ گوتی کاکە ئەمن ئیسلامم لێرە، دەزانم ئەتۆش ئیسلامی. (شیرۆ) گوتی کە دەزانی دەبی پێم برێی (رەیحانە) لەکێ سجنە؟ دەبی هەر بیدۆزمەوە ئەمن ئیسلامم ناوم (شیرۆیە) ناوت بیستیە؟ گوتی شازادە شیرۆ منداری ناو لانکێ لێت دوژمنێ هەنکە پێت بزانن خینت فڕدەکەن. دەبی سبەی زوو بڕۆی لە شاری بچیە دەرێ. پاشا پاش ئەوەی (مەزهەر) شای کوشت رەیحانەی بەئەسیری هینا لە هەردە روازەکی شاری هەزاران پالەوانی دانایە هەموویان هاوشانی (فەرهەنگ وفەخفورینە) کە ئەتو کوشتنت- شیرۆ گوتی ئەتو سبەینێ زبندانێ پیشانی مندەلەو کاتی مەیدانێ پالەوانان دەبینی... گوتی باشە - سبەینێ چایچی لەگەر شێرۆی هەتا نزیکی زنیندانەکەی چوو ئیشارەتی لۆکردو پیشانی داو گەڕاوە هەتا هیوارێ چاوەڕوان بوو کەشەو داهات بە تاقە سوارە هێرشی بردە سەر زیندانێ هەزار پالەوان بەجارەکی هێرشیان لۆ هینا لە پشتەوە

تیرەکیان لێداو بریندار بوو کەمەندیان هاویشتنێ چەندی تەکانی خۆیدا گرتیان بە کەمەندانو هاویشتیانە زیندانێ... خەبەر گەیشتە (خاقانی چینێ) کە (شێرۆ) گیرایەو هاویشیتانە زیندانێ خاقان زۆر کەیف خۆش بوو بە وخەبەرە گۆتی لێیگەڕێن بالەوێ بمری ماوەی دوازدە ساران شێرۆ لەو زیندانەی ماوە (گولچە هرە) کچی (خەزەندی) وەزیر کەژنی یەکەمی بوو کچەکی بوو ناوی (مەهتاب)ی لێنا (سیمو لعوزار)یش کوڕەکی بوو لەسەر داوای شیرۆی ناوی (جهانگیر)ی لێنا مەهتاب لە ناو منداڵان گەورە بوو، بەڵام سیفەتی هەموو کوڕانی بوو هەر حەزی لە شیروتیرو پاڵەوانبازیو سوارچاکی بوو تەمەنی گەیشتە سێزدە ساران بە (خەزەندی) دەگۆت بابە (گولچە هرە)ش هەر دەیگوت بابە عاقل ببو بیری کردەوە ئەوە نابێ بابی هەردوکان بی رۆژەکی بە داکی گۆت دایە ئەتو هەر دەرێی بابە ئەمنیش هەر دەرێم بابە نابی بابی هەر دوکان بی ئەوە دیارە بابی تووە بەڵام بابی من کێیە؟ گۆتی کچم ئەوە بابی تۆو بابی منە گۆتی بەو خوایەی، کە دەیپەرستین ئەگەر پێم نەرێی بابم کێیە ئێستاسەرت دەبڕم... گۆتی کچم چت لێ بشارمەوە بابت ناوی (شازادە شێرۆیە) ماوەی دوازدە سارە لێرە رۆیشتیە چەند سار پێش ئیستا گوێم لێبوو گوایە بە دوای (رەیحانەی) کیژێ (مەزهەر) شای ئێرانێ داچویتە مەملەکەتی چینێ لەوێ گیرایەوبێسە رووشوێنە ئەو مەسەلەی لەسیری هەتا پیازی هەموو لۆگێراوە (مەهتاب) گۆتی دایە ئەمن دەڕۆم بە دوای سۆراغی بابم هەر چەند (خەزەندی) ودزیرو (گولچە هرە) لەبەری پاڕانەوە نەچی گۆتی هەردەچم ئەسپەکی لە تەویلەی هینادەرێ نقابی پۆشی سواری ئەسپی بوو دوعاخوازی کرد بەرەو مەملەکەتی چینێ لەو لاش (جیهانگیر)ی کوڕی (سیمو لعەوزارێ) تەمەنی ببوە دوازدەسار لە ناو منداڵان گەمەی دەکردن لە مندارە هێتیمەکی داکی هێتیمەکە گۆتی هەڕو تۆرەی بابت بکەوە کەس نازانی لەکێ کەتیە بەمنداری من خۆت ئازامەکە... ئەویش گەڕاوە ماری پرچی داکێ خۆی گرت گۆتی بەخوای تاکو تەنیا ئەگەر پێم نەرێی بابم کێیە؟ لە کێیە؟ چی بەسەرهاتیە ئێستا سەرت دەبڕم داکی گۆتی کوڕم بابت (محەمەد) پاشای شامێیە... گۆتی عەیبە بۆ تۆلێرە دانیشتی لەقسان لەقەدیم هەندە هەندە پاڵەوان بوی دیارە هەمووی درۆیە ئەگەر ناکوناچوی سەرەکی لێ پەیدابکەی بابم ناوی شێرۆیە لە ئێرانێ (رەقەمی پۆرا کرۆژی) کوشیتە (فەخفوری) کوڕی

خاقانی چینی کوشیته حەفت شەو وحەفت ڕۆژان زۆرانبازی بە گەرەتو کردی: بە زەبری شیری ئەتوی هینایە هەمووم زانیە، بەلاّم من دەڕۆم بەدوای سۆراغی بابم گوایە بەردو ولاّتی چینێ چوەو نەگەڕایتەوە (سیمو لعوزار) ئۆوی کوت گێ لێبووە هەمووی ڕاستە، بەلاّم من نەوێرام ئەو مەملەکەتەی لەترسی خاقانی چینێ بە جێبیێلم نەوەک بێتە سەر مەملەکەتی ئیردش بە دەردی ئیرانی ببا ئەتو دەڕۆی ئەمنیش دێم هەرچەند (سیمولعەوزارێ) ڕەجای لێکرد گۆتی کوڕم هێشتا ئەتو منداری مەیدانداریی نازانی لە داکت فێرببە دەبی لە گەرت، بێم ئەوانیش لەولای بە جوتە سوارە لە شاری چونە دەرێ بەرەو مەملەکەتی چینێ چەند مانگان ڕۆیشتن لە ڕێی دیتیان تۆزی سوارەکی بە تەنیا لەرێێ دێت ئەویش بەرەو مەملەکەتی چینی دەڕوا ئەو سوارە لە ڕۆیشتنی لەسوار چاکی دیارە پالّەوانە ئەوانیش بە جۆتە سوارە لەسەر ڕێی ڕاوەستان گۆتیان ئەگەر دوژمن بی ئەوە چاری دەکەین ئەگەر دۆستیش بی ئەوە دەبینە سێ سوار مەملەکەتی چینێ وێران دەکەین ئەگەر شێرۆ چی بەسەر هاتیێ کەلێیان نزیک بوەوە دیتیان نیقابپۆشە سلاوی لێکردن جوابیان داوە گۆتی لۆ لەسەر ڕێێ من ڕاوەستاینە؟... گۆتیان بزانین ئەو سوارە بەتەنیا دێت چ سوارە؟ دۆستەیان دوژمنە ئەگەر دوژمن بی هەتا چارەی بکەین لەو چۆ لەوانیەی گۆتی ئەنگۆ دووسوارن ئەمن یەکم بەلاّم ئەگەر هەزار سواریشم لەسەر ڕێێ بێ ناتوانی ڕێێ لەمن بگری ئەمن هاتیمە مەملەکەتی چینێ وێران بکەم... گۆتیان خێرە بەوشێوەی دوژمنی مەملەکەتی چینی؟ گۆتی لەدوسوارەکی هاتیمە دوازدە سارپیش ئیستا هاتیتە مەملەکەتی چینێ نەگەڕایتەوە... گۆتیان ئەو سوارە کێیە؟ گۆتی (شازادە شێرۆیە)... گۆتیان ئەتو چ حەقت لەو شێرۆیەی هەیە ئەوە کوڕی خاقانی چینی کوشیتە... گۆتی دفاعی لە مەملەکەتی ئیرانێ، لەشەرەفو ناموسی مەکردیە فەخفور هاتبوو (ڕەیحانە)ی کیژی پاشای ئیرانێ بەزۆرببا ئەویش قبولی نەکرد لۆیە فەخفوری کوشت... بەلاّم بزانم ئەنگۆ چ کارەنە؟ لۆئەو پرسیارانە دەکەن؟ (سیمو لعوزار) نقاپۆش بوو گۆتی ئەمەش هاتینە دوژمنایەتەکی کۆنن لەگەر خاقانی چینێ هەیە (جهانگیر) گۆتی مادام وابی بادەست لە ناو دەست بەرەو مەملەکەتی چینێ بچین بەسێ پالّەوانان کاولی بکەین هەرسێ سوارە بەرەو مەملەکەتی چینێ شۆڕبوونەوە لەلایەکی داخلی مەملەکەتی چینێ بوون لە دەرگەی نەچوونە ژۆرێ لەلاپەڕی شاری

چوونه ماری پیرەژنەکی مستەزێرەکیان لەدەستی کرد پیرەژن دیزەو گۆزەی پێکداادان ژۆری لۆ چولکردن زۆری بەخێر هینان خواردنی لۆ حازر کردن پاش نانخواردن پیرەژن گۆتی پرسیارەک دەبی بزانم لە چ دەگەرێن لۆ چ هاتینە؟ گۆتیان پیرەژن ئەمە پیش دوازدەساران سوارەکن هاتیتە ئێرە نەگەرایتەوە هاتینە سۆراغی بکەین... گۆتی ناوی چییە؟ گۆتیان ناوی (شێرۆ)یە... پیرەژن ئاخەکی هەرکێشا... گۆتی چاوم کوێر بی ئەوە دوازدە سارە لە زیندانێ تایبەتی پاشای سجنە کەس نیە لێی بپێچتەوە، سۆراغەکی بکا ئەنگۆ یەکەمین کەسن هەوالی دەپرسن... گۆتیان پیرەژن دەتوانی پیشانمان بدەی؟ گۆتی کورم هەزار پالەوانی نەقەنەقە نۆبەتداری ئەو سجنەیە کەس نایگاتێ گۆتیان پیرەژن دور بە دوری پیشانن بدە... گۆتی کورم ئەو قەسرێ سپی کە لەسەر گردی دیارە ئەوە قەسرێ پاشایە لە تەنیشتەوی زیندانە لەوێ سجنە... (مەهتاب) گۆتی ئەو سوارەی باسی دەکەین ئەود بابمە ئەمن ئەو شەودەچم راناوەستم ئەمن ناوم (مەهتابە) کاتی خۆی ئەمن لەزگی داکم بوم شێرۆ ئێمەی بە جێهێشتیە داکم (گولچە هرەیە) کچی خەزەندی وەزیرە... (سیمو لعوزار) گۆتی کەواتە ئەوەش (جهانگیری) براتەکاتی خۆی شێرۆ ئەمنی لە مەیدانی لە عاردیدا بووم بەحەلالی ئەو، ئەو کورەم لە شیرۆ هەیە ئەمنیش کچی (محەمەد پاشای) شامم ناوم (سیمو لعوزارە)، بەلام بە گوێی من دەکەن ئەوشەو راوەستن سبەی شەو دەچین (مەهتاب و جهانگیر) گۆتیان راناوەستین خۆیان ئامادەکرد هەر بەو شەوە بەرەو زیندانێ کەتنە رێی بە جووتەسوارە پاسەوان دەنگیان دان نەیە نەپێش دەکوژرێن، بەلام ئەوان یەک لەدەستە راست یەک لەدەستە چەپ رویان دەزیندانێ کرد (جهانگیر) زوو گەیشتە سەر زیندانێ بانگی کرد بابە جواب نەبوو دیسان بانگی کرد بابە زۆر بەکزی دەنگی لە ناو زیندانێ هات گۆتی ئەتو (جهانگیر)یان (جیهانبەخشی) گۆتی بابە ئەمن (جهانگیرم) خۆت لەکەمەندی بێخە گۆتی هەی داک ماکەر ئەمن دوازدە سارە لەو زیندانەی بوومە هێسک وپێست تازە بەدوامدا دێی ئەگەر ناتوانی هەر مکێشی لێم گەرێ بەرێمەوە دەمرم گۆتی بابە خۆ لە کەمەندی بێخە... شیرۆ خۆی دەکەمەندی هێخست (جهانگیر) هەری کێشا لەولاش (مەهتاب) بەناو پاسەوانان کەت هەتا ئەو شێرۆی هینادەرێ دوو سەد پالەوانی سەربری (جهانگیر) شێرۆی هاویشتە پشتەخۆی بە جۆتە سوارە بەرەوماری پیرە ژنێ

گەڕانەوە لەوێ شێرۆو جهانگیرو مەهتاب دابەزین (سیمو لعوزار) نوشداری هینا لەبن کونە کەپوی شیرۆی راگرت شیرۆ هەندەک نەفەسی هاتەوە بەرێ وەقسە هاتەوە گۆتی (سیمو لعوزار) ئەوانە کێنە؟ گۆتی ئەوە (مەهتابە) کچی (گولچە هرەی) ئیرانی ئەوەش (جهانگیرە) کوڕی منە... گۆتی هەی پیرە قۆترئەدی لۆ دوازدە سارە لەمن ناپێچیەوە؟ گۆتی شێرۆ ئەتو زۆر مەغرور بووی نەمگوت بەتەنێ شەڕێ خاقانی چینێ بەتو ناکرێ لۆهاتی لەرکی هەندێ ئەمن بەدواتدانە هاتم... گۆتی هەتا شەو مایە برۆن (رەیحانەی) دەربینن ئەگەر مابی هەر بەوشەوە شێرۆیان لەلای (سیمو لعوزارێ) بە جێهێشت بەردو زیندانێ گەڕانەوە رەیحانە شیان ئازاد کردو هاتنەوە... لۆ بەیانی هەموو پێکەوە بەناو مەملەکەتی چینێ کەتن بەماوەی هەفتەکی مەملەکەتیان وێران کردو هەزاران پالەوانیان سەربری خاقانی چینێ چی لەدەست نەمابەتکەکی بەریخی لە ملی خۆی کرد ئالای سپی هەرداکە تەسلیم بوو بەس نەیکوژن ئەوانیش عەفویان کرد لەبەر ئەوەی فەخفوری کوری کوژرابوو هەموو پێکەوە گەڕانەوە بەرەو ولاتی شامێ لەوێ رەیحانەشی لە خۆمارەکرد ئەوە بوو بەسێ ژن ماوەکی لەوێ بوو هەموو پێکەوە بەرەو مەملەکەتی خۆیان گەڕانەوە لە دەرەوەی شاری شوانەکی دیت گۆتی چ هەیە لەو شارەی گۆتی وەللا لەوەتی شازادە شیرۆ نەمایە شازادە (ئەرچە)ی برای بوبتە پاشا خەرک زۆر ناڕازیە بابیشی چاوی کوێر بوینە لەوەتی شێرۆ بزربوە. ئەویش بە کۆمەڵ چوونە ناوشاری خەبەریان دا پاشای کە شیرۆ بەخۆیو بەکۆمەرە سوارەکی هاتەوە (ئەرچە) لەترسان خۆی هاویشتەلای باوکی کە شیرۆ نەیکوژی شێرۆ هاتەلای بابی دەستی ماچ کردبە ئەرچەشی گۆت ئەمن وەک تو نمەک حەرام نابم هەستە عەفوم کردی، بەلام پاشایەتی بەکەلکی تونایێ ناردیەوە مارێ بە خۆی بووە بەپاشا داکو بابی هینایە وەکۆشکی پاشایەتی هەرسێ ژنەکە هەریەکی لە قەسەرەکی دانان چەند منداری بوو تەمەنەکی دریژی بردە سەری بەکەیف خۆشی، بەسەر بەرزی هەتا عەیامەکی زۆر هەزار رەحمەت لە گوێڕادێران بی، ئەمنیش هاتمەوە کارەشم دڕا چم پێنەبڕا.

*** ئەم هەقایەتەم لە (حاجی رەسول وسوانی) وەگرتووە کەئێستا لە هەولێر دادەنیشی تەمەنی نزیکەی ٨٥ سالە.**

دەگێڕنەوە لەزەمانی کۆن ژنە هەژارەک لە شارۆچکەیەکی دەژیا بەبێوەژنی کەسی نەبوو غەیری خوداو پێغەمبەری، یەک تاقە کوڕی هەبوو لە عومری دوازدە سێزدەساران ناوی (ئەحمەد) بوو، شاگردی ئاسنگەرەکی بوو رۆژی یەک لیرەی هەبوو ژیانیان پێ مەیسەر دەبوو، رۆژێ هەتا ئیوارێ پیرەژن نەسیحەتی بۆ ئەو تاقە کوڕەی ئەوە بوو، کوڕم هەرچیدەکەی بیکە، بەس هاوڕییەتی قەشەی مەکە، قەشەک لەو شارەی هەیە زۆر بەمەکرو حیلە بازە، هەرچی هاوڕییەتی بکات دەیفەوتینی. کەس لەتە لەسمانی دەرباز نابی، کوڕەکە هەر دەیگۆت، نەسیحەتت بەسەرچاوم دایە، ئەحمەد خەریکی شاگردی خۆی بوو ئێوارانیش دەگەڕاوە لای دایکی- یەک هۆدە خانیان هەبوو. ئەحمەد هەتا دەهات جوان وقیت و قۆز دەبوو تا وایلێهات خەرک دەستە دەستە دەهاتنەپێش دوکانێ بۆ تەماشاکردنی، هەندە گەنجەکی نازداربوو. ناوبانگی لەو مەملەکەتی بڵاوبووەوە، قسە گەیشتە قەشەی، قەشە سەری سوڕماکو هەتا هەنووکەپێینە زانیە... پاش نیوەڕۆ قەشە خۆی رێکخست تەسبیحی هەزار دنکی لەملکردو بە مەکرو حیلە خۆی لە قاند بەرەو گەرەک و دوکان کەوتەرێ. کەگەیشتە بەردەرکی دوکانێ سەیریکرد خەڵک دەستە دەستەوەستاون سەیری جوانی و دەست و چەکوچی ئەو کوڕە لاوەی دەکەن. قەشە بەمەکرو حیلە خۆی لە قاندو رێی لۆ خۆکردەوە چووەپێش سەلامی کردو لە دوکان چووە ژوورێ، ئەحمەدیش زۆر رێزو قەدری گرت لەسەر کورسی داینا بەخێرهاتنی کرد کە کابرایەکی ئاینییە وردێن سپیە. دەمەک دانیشت پاشان قەشە پرسی کوڕم ناوت چیە؟ گۆتی ناوم ئەحمەدە، قەشە ئافەرین بۆدەست و چەکو چت ئەتو کوڕی وەستای ئەحمەد نا وەڵلا لێرە شاگردم قەشە، ئافەرین بۆ تۆرۆڵەم دەمەک دانیشت دوعا خوازی کرد رۆیشت. رۆژی پاشتری بەهەمان تەرتیب هاتەوە دوکان زۆر بەخێر یانهێنا. ئەو رۆژە هەتا عەسردانیشت پاشان بە ئەحمەدی گوت کوڕم زۆر پێمنا خۆشە لاوەکی وەک تۆ ئەوها نازدار لەو ئاسن و ئاسنگ رییەخۆت بکوژی!

ئەحمەد گۆتی: مامە ئەمن کاسبی دەکەم بەرەنجی شانم دەژیم. قەشە گۆتی کورِم حەیفە ئەو کارە گرانەی بکەی، ئیشی سوکتر زۆرە. ئەحمەد ئیشی کومامە؟ گۆتی: کورِم من ئیشم هەیە هەموو رۆژێ سەدلیرەی لێقازانج بکەی، رۆژێ لیرەیەک چییە؟ گۆتی ئیشەکە چییە مامە؟ قەشە گۆتی کورِم ئەتو ئەو ئیشەی بەجبێبێلەو هەقت نەبێ، بۆ رۆژی دوایی ئەحمەد بێ ئەوەی ئەو بەسەر هاتە بەدایکی بلّێ ئیشەکەی خۆی بەجێهێشت چووەلای قەشەی ودانیشت قەشە گۆتی ئەحمەد جامەک ئاوم بۆبینە. ئەحمەد جامەک ئاوی هیناو قەشە لەگیرفانی پریاسکەیەکی سپی دەرهینا خستیە ناو ئاوەکە، یەکسەر پەیت بوو وبوو بەیەک پارچە زێرِ. قەشە زێرەکەی لە قاپەکە دەرهێناو خستیە ناو دەسرۆکەکی رۆیشتە لای زێرِینگەرەکی و بەهەزار لیرەیان فرۆشت. قەشە گۆتی ئەحمەد ئەوەسەت لیرە لۆ توو ئەویدیش لۆمن. هەموو رۆژێ ئەوسەت لیرەت هەیە لەلای من، بەلاّم ئەحمەد ئەوکارە سرِرِەو نابی کەس پێبزانی هەتا داکیشت نابێ بزانی. ئەحمەد گۆتی: باشە بەسەرچاو پارەکەی بردەوە ماریّ دایە دەستی داکی، داکی سەری سورِما، هەرچەندە پێگوت کورِم بەجارەکی سەت لیرەت لە کێهێنا؟ گۆتی دایە لەئیشی خۆم لە ئاسنگەری. هەرچەند داکی باوەرِی نەکرد، بەلاّم گۆتی کورِم کەیفی خۆتە. چەند رۆژەک بەو جۆرەی هەموو رۆژێ سەت لیرەی هەبوو. رۆژەکی قەشە گۆتی ئەحمەد شەوەکی دەبی لەلای من بمێنیەوە دابنیشین زۆر قسە هەیە لە بابەت ئیشەکەمان دەبی گفتوگۆی لەسەر بکەین. ئەحمەد گۆتی مامە ئەمن ناتوانم لەبەر داکم لە هیچ جێگابم شەوێ، بەلاّم ئەتو وەرە لای من شەوێ داکم دەنێرمە مالێ جیرانەکە مان، قسەی خۆمان دەکەین بەئیسراحەت. قەشە گۆتی باشە، شەوەک رۆیشتە مالێ ئەحمەدی، نانیان خوارد پێکەوە. ئەحمەد گۆتی دایە ئەوشەو تۆ لەمالّی ئەو جیرانەمان بنوو من لەگەلّ وەستام هەندەک قسەی نهێنیمان هەیە. داکی گۆتی کورِم لۆ ئەوە کێیە؟ گۆتی دایە ئەوە وەستا ئاسنگەرەکەمە دایک هەرچەندە دوو دلّ بوو، بەلاّم نەیدەناسیێ گۆتی دیارە وەستایەکەیەتی گۆتی کورِم زۆر ئاگاداری خۆت بەدلّم زۆرتوندە ئەمشەو نزانم لۆ... بەلاّم خواحافیز قەیدیناکا داکی ئەحمەدی رۆیشتە ماری جیرانیان قەشەو ئەحمەد بەتەنها مانەوە... قەشە گۆتی ئەحمەد پەرداخەک ئاوم لۆبینە ئەحمەد چوو ئاوی لۆبینی هەتا هاتەوە حەبەکی خستە ناوپەرداخی ئەحمەدی کە ئەحمەد فرِەکی لە پەرداخەکەی خۆبدا

پاش کەمەکی بەلادا کەوتوو بێهوش بوو. قەشە ئەحمەدی خستە سەرشانی خۆی لە دەرگا هاتەدەرێ. نیوەشەوبوو نزیک بوو بەیانی دابێ، کەس لە دەرێ نییە. قەشە خۆی خستە ناو کۆلانان لاشەی ئەحمەدی لەسەر شانیە. لەنیوەی رێ پیرەمێردەک دیتی واقەشەی نالەبار لاشەکی لەسەر شانیە گۆتی بۆ کوێ هەی فێلباز ئەولاشەیە بۆ کوێ دەبەی؟ قەشە شمشیری هەر کێشاو لەسەری پیرەمێردیدا، پاشان فیراری کرد. کابرا بەبرینداری کەتە ناوکۆرانان. قەشە جەماعەتی هەبوو کە ئەوکارەی دەکرد گەیشتە لایان گۆتی هینام. بەرەودەریا کەتنە رێ کەشتی حازر بوو سواربوون کەشتیەکی زۆر گەورە بوو قەشە لەو کارەی سەد نەفەری هەبوو هەمووریان سواربوون ئەحمەد بە هۆش خۆی نەهاتەوە. رۆیشتن لە ناو دەریا کەشتی میریان لێپەیدا بوو کەباج وسەرانەیان لە بارزگانە کانی ناودەریاوەر دەگرت، بانگیان کردن: راوەستن قەشە گۆتی رابوەستین ئیشمان تەواو ئاشکرا دەبێ زوو لێخورە رامەوەستە. کە کەشتی میری دیتی راناوەستنی تەقەیان لێکردن کەشتی میری چارپێنج نەفەر بوون ئەوانیش سەد نەفەرلێیان بوو بەشەڕ... بائەوان لێرە شەڕبکەن بێینە سەرباسی خەلکی شارودەنگو باسی شار. خەلک کەبەیانی هەستان لەخەو دیتیان پیرەمێرد لە کۆرانەی کەتیەو بریندارە هەریانگرت بردیانە مارێ لێیان پرسی، گۆتی شەو قەشەی فێل بازم دیت زەلامەکی لەسەر شانی بوو بردی منیش گۆتم ئەوە چییە؟ شمشیرەکی لەسەری من داو برینداری کردم بە خۆشی رۆیشت...
خەرکەکە کۆبونەوە هەرچەند کردیان نەیانزانی بەرەوکام لابرۆن بە دوای ئەحمەد گۆتیان (مام کاوێس) ئەگەر ئەو بەکتێب ورملو نجووم بزانی ئەحمەدی بەرەو کاملا بردییە ئەگەر نا کەسنازانی. چەند کەسێک چوونە لای مام کاوێس. ئەویش تەماشای کتاب ورملو نجومانی کرد گۆتی ئەلحەمدو لیللا ئەحمەد مایەو نە مردیە ئەوە لە ناودەریایە بەزوترین کات بیگەنێ ئەگەر نا ئەو سیحربازە دەیباو دەیفەوتینێ. خەلکەکە سواری کەشتی بوون بە دوایدا چوون دیتیان ئەوە لە بەینی دوو کەشتی شەڕو تەقەیە. بەلام کەشتیەک ئالای حکومەتی پێوەیە ئەوانیش زانیان شەڕەکە لەگەل جەماعەتی حکومەتی یە، چونە لای کەشتی حکومەت ئالای سپیان هەلکرد کە چوونە پێش پرسیان. پۆلیسەکان گۆتیان ئەو کەشتیە ئەوە پینج رۆژە لەگەرەمە شەڕیانە تەسلیم نابن. گۆتیان ئەوە کەشتی قەشەیە ئەحمەدی دزیەو دەیبا دەیفەوتێنی. قەشەش

کەزانی کەشتی حکومەت هیمدادیان لۆهات ئەحمەدی وەهۆش خۆی هێناوە، ئەحمەد پرسی ئەو تەقەو هەرایە چییە؟ قەشە بە مەکرو حیلە گۆتی ئەحمەد گیان ئەوە پۆلیسی حکومەتن ئەگەر پێمانبزانن دەمانگرن. ئەوەش خەلک هاتیە وادەزانن ئەمن ئەتوم دزییە. دەمەوێ بتکوژم هەستە بەخوت برۆ سەرکەشتی بانگیان بکەمن ئەدزراوم من ئیشم لەگەل ئەو کابرایە هەیە بۆ خۆمان ئیشی تایبەتیمان هەیە واز لەمن بێن بگەرێنەوە من پاشان بە خۆم دێمەوە. ئەحمەد چووە دەرێ لەکەشتی بانگی خەلکی کرد خەلکینە بگەرێنەوە من ئیشم هەیە لەگەل ئەو جەماعەتەی پاشان دێمەوە تکایە کەس خۆی لەسەرەمن بەخەم نەکات، من دێمەوە، پاش ئەوەی ئیشەکەمان خەلاس کرد، توجار باش نینە پۆلیسی باجستێن بەدومان بکەون، ئەگەر حەز دەکەن وەرنە ناوکەشتی بپشکنن کە خەلکە کە ئەمەیان گوێ لێبوو بەدل ساردی گەرانەوە. پولیسیش وازای لێهێنان، قەشەو ئەحمەد وسەت نەفەرەکە کەشتیان زۆر بە توندی لێخوری هەتاسێ شەو وسێ رۆژان هەر رۆیشتن، بۆ رۆژی چوارەم گەیشتنە جێیەکی لەوێ قەشە ئەمری کردو راوەستان. قەشە بەنەفەرەکانی گۆت ئێوە خواحافیزتان بێت من لەگەل ئەحمەد بە جێبێلن، بەلام پاش سێ رۆژی تروەرنەوە دوامان. وتیان باشە ئەوان رۆیشتن. ئەحمەد بەقەشەی گۆت مامە ئەوانە لۆ. رۆیشتن ئەمن وئەتو ماینەوە بەتەنیا؟ گۆتی رۆلەمن نامەوێ کەس سرری ئیمە تێبگا، باجەماعەتیشمان نەزانن، هەستە بابروین. بەجۆتە کەوتنەرێ بە پیادە ماوەیەکی زۆر رۆیشتن گەیشتنە بناری چیایەک، چیایەکی زۆر بەرزو عاسێ ولووس چ رێگای بۆ سەرکەوتن نەبوو، لەبن چیایەکە دانیشتن. قەشە بە ئەحمەدی گۆت برسیتە؟ ئەحمەد گۆتی ئەرێ وەللا قەشە گۆتی ئەحمەد ئەتو ئیسراحەت بکەمن دەچم خواردنەک پەیدا دەکەم. ئەحمەد لێی پاردواە قەشەش چووە ئەو بنارە لەوێ کیویەکی کوشت هینایەوە. کەدیتی ئەحمەد هەر نووستیە، ئاگری کردەوە سۆری کردەوە. بانگی ئەحمەدی کرد، هەرستا کەتنە سەرگۆشتی هەتا تێریان خوارد. ئینجا بە ئەحمەدی گۆت: ئەحمەد ئەو چیایە سەخت و بێرێیەی دەبینی، گۆتی ئا! گۆتی: دەتنێرمە سەر ئەو چیایەی لەوێ جۆرە گیایەک هەیە دەبی بینی دەگەر جۆرە گولەکی کەپەلکی شینی کالە وەکو پەلکی دار هەنارە، چەندەسکە گولان لەوێ فرەدە خوارێ. ئینجامن چۆنم ناردی ئەوهاش دەتهینمەوە، من پیر بویە ناتوانم، بۆیە

دەبی ئەتو بچی، ئەگەر نا ئەمن هەمـوو جـار هەر بەخـۆم چویە پێش ئێـسـتـا.
ئەحـمەد گـۆتی: فەرمانتەمامە، من ئامادەم.قەشە بانگی تەیرەکی کرد ناوی (هێڕە) بووسێ جار بانگیکرد هێڕە ئامادە بوو گۆتی دەبی ئەحمەدی ببەیە سەر ئەو چیـایەی هەرکـاتی گـوتم هیـڕە بیگەڕێنەوە زوو بیـگەڕینەوە. هیـڕە سـەری راوەشاند بەمـانای بەڵێ. ئەحـمەدی خـسـتـە سەر بارەکـانی خـۆی، فڕیە سـەری چیایەکە، لەوێ ئەحمەد کەسەیری کرد سەری ئەو چیایەی پڕە لەگوڵەوە نەوشەو نێرگزو هەموو جۆرە گیایەک، گەڕا تا ئەو گوڵ و گیایەی دیتەوە. چەند چەپکی لۆ قەشەی لێ فـڕێدا خـوارێ. قـەشە ئەو گـیـاو گـۆرەی پێکـەوە دەکـوتاو دەرمانی لێ دروست دەکـرد کـە لە ئاوی دەکـرد دەبووە زێڕ زۆری فـڕێدا ئەحـمـەد، هەتا قەشە ئیشارەتی لۆ کرد گۆتی بەسە... ئینجا قەشە ئیشارەتی لۆ کرد لەوێ بمرە من ناتهـینمـە خـوارێ. ئەحـمەد کـەزانی قـەشە فـێری لێکرد چەند هاواری کـرد بێسـوود بوو. چەند هاواری هێڕەی کرد، چ هێڕە لە دوای هاواری ئەو نەهات. قـەشـە بەسیـحـر دەیهـینا، بەڵام ئەحـمـەد بەسـتـە زمـانە چۆن لە دوقـسـەی ئەو دیێت... قـەشـە بـای بای لە ئەحـمـەدی کـرد، گـوڵەکـانی هەرگـرت گـەڕاوە لای دەریا، لەوێ کـەشـتی حـازر بوو گـەڕانەوە شـاری خـۆیان. ئەحـمـەد بەتەنیـا لەسـەرسـەری ئەو چیـایەی مـایەوە، هەمـوو لای هەڵدێر بوو یەک لای ئاو بوو، کەڕوانی پڕە لە فـیل، شێر، گورگ مەیمون... ئەحمەد هەتا ئیوارە گەڕا ئیـۆارە چووە سـەردارەکی لە ترسی حـەیوانی دڕندە، بەیانی دیسـان هەرسـتـاوە، خەنجەری لەلا بوو لە قەشەی وەگرتبوو ئێوارە لە شێرەکی ڕاست هات شێری دابەر خەنجەران کوشتی. ئەحـمەد ماوەی یەک مـانگ لەو چیاو چۆلەی مـاوە خواردنی وەکی حەیواناتی ببووە گژوگیاە رۆژەک ئەحمەد کەسەیری کرد سەر ئەو شاخو داخەی هەموو هێسکی مرۆڤە قەشەبەو دەردەی بردینە.

ئەحمەد لە دلێ خۆی گۆتی هەتا لێرە دەمرم هیچ چارەم نییە سێلام شاخە لایەکم ئاوە بەتەمای خوای لۆ لای ئاوەکە خۆم فڕێدەدەمە خوارێ ئەگەر مردم ئەوا مردم ئەگەر خواش نە جاتیدام شوکرم... بەیانی زوو ناوی خوای لێهێناو چەند ئایەتی خـۆێندو خـۆی فـڕێدایە خـوارەوە بۆ ناو ئاوەکـەی. خـوا پاراسـتی ماوەیەک بێهۆش بوو کە هاتەوە هۆش خۆی دیتی والە کەناری دەریایە لە قوڕو لیتەی غەرق بووە. هاتەدەرێ دەموچاوی شوشتن ناوی خوای لێهێناو رۆیشت. نازانی بۆ کـوێ دەڕوات چ مـەملەکـەتەکـە ئاوەدانی لێ نییـە... بۆ مـاوەی سێ

شەوو سێ ڕۆژان ڕۆیشت ڕۆژی سێیەم ئێواریێ گەیشتە سەردەریایەکی کەسەیری کرد قەسرەک لەناو دەریایە زۆر جوان و بەدیمەن و بڵندە. گۆتی خودایە پەناهم بەتۆ خەلاسم بکەی لە دەست دێوو جادوو جانەوە رو سیحربازان، کە گەیشتە کەناری دەریادە موچاوی شوشت قومەک ئاوی خواردەوە سەری بڵند کرد بانگی کرد. ئەی ئەهلی قەسرکێ لەوێیە جوابم بدەنەوە، ئەمن زۆر هیلاکو سەرگەر دانم، برسیمە، ڕوتم کەروانی کچەک هاتە پێش هەیوانەکەی راوەستاوەک مانگی چواردە شۆقی دەدا ئەوودەشتو دەرەی- گۆتی ها! غەریب چیت پیویستە؟ گۆتی نازەنین من هەژارم ریم کەوتیتە ئێرە ئەگەر پاروە نانەک شتەکم بدەنێ؟ کچە کە زۆر زگی پێسوتا گۆتی راوەستە، چووە خوارێ. ئەوانە حەفت خوشک بوون لەو قەسرەی بەتەنها دەژیان، کچەکە خەبەری دانێ هەموویان هاتنە دەرێ، کەشتیەکی گچکەیان نارد گەیشتە لایان سەلامی کرد جوابیانداوە سەرکەوتنە سەر قەسر گۆتی: خوشکان لێم مەپرسن چمە، چنیمە ئێستا من برسیمە هیلاکم خەومدێ پیسم. یەکسەر خواردنیان لۆ ئامادە کرد. تێری خواردو چووە حەمام خۆی شوشت جێیان لۆ ڕاخست لێنوست. کە بەخەبەر هات ئەو حەفت خوشکە لەلای دانیشتینە. ئینجا بەسەرهاتی خۆی لۆگێڕانەوە. ئەوانیش گۆتیان ئێمە حەفت خوشکین بابمان لەترسی دێوی سپی ئەمەی لێرە دانایە، سارێ دووجار دەچینەوە مەملەکەتی بابم، هەر شەش مانگ یەک مانگ لەوێ دەبین پاشان دێینەوە ئێرە، باوکیشمان پاشای شاری (زەرەنگینە) لێرەش ئێمە بێ پیاوو بێ براین وەرە ببە برای ئێمە، دانیشە لەلامان. پیرە داکەکت لەو شارەی بەجێ هێشتیە یانا، ئیستا خوا دەزانی مردیەیان مایە. لەوێ کچی بچووک کەناوی(ریشوا) بوو زۆر ئیلحاحی کرد ئەحمەدیش رازی بووکە لەلایان بمێنێتەوە. ماوەیەک بەکەیف و سەیران لێی پاڵداوە. ڕۆژەک دیتی(ریشوا) هاتە ژوورێ چاوی سۆر بووە لە گریان ئەویش راپەڕی هاخوشکە گچکە، لۆ دەگرییی کێ غەدری لێکردی، هەتا پارچە پارچەی بکەم. گۆتی کەس، لە دووری تۆ دەگریێم، دەناڵێنم، بەیانی مەوعیدمانە بروینەوە ئەگەر یەک ڕۆژ دوابکەوین باوکم دەزانی یان دزراینە یان کوژراینە شتەکمان بەسەرهاتیە یەکسەر بە دوماندادێ لە شکر دەینی، پێویستە بەیانی بروین چل ڕۆژ بەجێت دەهێلین ئەحمەد زۆر غەمبار بوو. هەستا چووە لای خوشکەکانی تر، ئەوانیش هەر واغەمبار بوون. گۆتی گوێ مەدەنێ

خوشکان ئەوە ئیرادەی خوایە چل ڕۆژیتر بە سەلامەتی دەگەڕێنەوە ئینشائەڵڵا.
ئەوانیش هەرستان ئەسبابی سەفەریان حازر کردبۆ بەیانی کە ڕۆژ هاتە دەرێ سواری کەشتی بوون بۆ ماوەی نیو سەعات کەشتی دەڕوا لەوێ دەگەنە مەملەکەتی مامیان ئەویش ڕەوانەی ماڵەوەیان دەکات خواحافیزیان لە ئەحمەد کرد گۆتیان ماڵێ ئێمە هەمووی لەبەر دەستی تۆیە ئەوەش کلیلی هەموو ژوورەکان، بەڵام ئەحمەد یەک ڕەجامان هەیە ژورێک لەسەرەوەیە مەیکە ڕدوە ئەوانی دی هەمووی قەیدی ناکا، ئەحمەد ئەو ژورەی بکەیەوە زەرەردەکەی بە قوربانت بین. ئەحمەد گۆتی خوشکان زۆر باشە، خواحافیزتان بێت. کە خوشکی ڕۆیشتن ئەحمەد مایەوە بەتەنیا بێ هاودەم ماوەی یەک هەفتە هەر چۆنیک بوو ڕایبوارد هەموو ژوورەکان دەگەڕا هیچ نەبوو.
پاش هەفتە یەک گۆتی ئەگەر ئەو ژوورەی نەکەمەوە دڵم ئیسراحەت ناکات. چووە سەربانوو ناوی خوای هێناو دەرگەی کردەوە کەسەیری کرد لە پشت ئەو دەرگەیەی یەک باغو باغاتی لێیە، گۆتی ماشاڵڵا هەمووی سەوزاییە هەموو جۆرە گوڵێکی لێیە، ئەنواعی میوەی لێیە. گۆتی دیارە ئەو خوشکانە لەگەر من خائین بووینە لۆیە بەمنیان گۆت ئەو ژوورەی نەکەیەوە. کە چووە ناو ئەو باغو باغاتەی گەڕا دیتی حەوزەک لە ناوەندی ئەو باغەیە، ئاوی هەندە سازگارو جوانە کەس دڵی نایێ تەماشای بکات. تائێوارە بەکەیف خۆشی ڕایبوارد. وەختی عەسر داهات کە سەیری کرد دوو کۆتر هاتن لەسەربانی قەسرێ نیشتنەوە. ئەحمەدیش خۆی شاردەوە کەدیتی ئەو دوو کۆترە هاتنە سەر حەوزەکە پەڕو باڵیان داکەندن کەسەیری کرد بوونە دوو کچی چواردە پانزە ساڵێ مێوژە ڕەشی بخۆن لەگەر دنیان دیارە. هەندە نازدارو کۆک بوون، ئەحمەد یەکسەر بەتیری کیژی گچکە لێدراو عاشقی بوو پاش سەعاتەکی پەڕوباڵیان دەبەر کردنەوەو ڕۆیشتن بۆ ڕۆژی دوایی هەر بەوشێوەی هاتنەوە ناو باغی گوڵیان بۆندە کرد باز بازێنو غارغارێنیان دەکردشەڕە ئاویان دەکرد. مەلەوانیان دەکرد پاش سەعاتەکی دیسان پەڕوباڵیان دەبەرکردنەوەو ڕۆیشتن.
ئەحمەد هەتا خوشکان هاتنەوە ئەوە کاری ڕۆژانەی بوو. ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازترو بێڕەنگ تردە بوو. کە ڕۆژی هاتنەوەی خوشکان داهات ئەحمەد بەغەمباری چاوەڕوانیان بوو بەڵکو چارەیەکی بکەن کە خوشکەکان هاتنەوە پاش چاکو چۆنی لەگەڵ ئەحمەد، کەدیقەتیان دایێ ئەحمەد ڕەنگی زەرد بووە

یەکسەر زانیان مەسەلە چییە... (ریشوا) ئەحمەدی جودا کردوەو لێی پرسی ئەی برای گیانی لەڕەنگت ڕادیارە غورفەی سەرەوەت کردیتەوە. گۆتی خوشکێ قەت نەمزانی واخۆم دەفەوتینم. ریشوا گۆتی ئەحمەد ئەوانەت کەدیتینە ئەوە کچی پاشای پەریانن. لەگەڵ مرۆڤدا ناژین ئەو فکرەی لەسەرت دەرکە. بەخوا پەشیمان دەبیەوە هیلاکیش دەبی، کچی جوان زۆر زۆرە هەرکێی داوابکەی ئێمە بە بابمان بۆت دەخوازین بەسڕواز لەوانە بینە.

ئەحمەد گۆتی چارەنییە ئەگەر لە ئەجندەش بی دەبی ئەو کچە هەربێنم. ریشوا کەزانی هیچ چارەنیە گۆتی ئەحمەد یەک ڕێگا هەیە ئەگەر سەرکەوتی ئەوە دەیهینی ئەگەرنا دەبێ سوند بخۆی کەوازی لێ دەینی، بەڵام لای خوشکان باسمەکە ئیوارێ وەختی عەسرێ دەچینە ناوباغی ئەوان هەموو رۆژەک دێن هەر وەکی جاران پەڕو باڵیان دادەکەنن دەست بەیاری و سوحبەتو سەیران دەکەن ئەوەی ئەتو گەرەکتە پەڕو باڵێ بەنیشان بکە کەنزیکی گەڕانەوە یانداهات خۆت بگەینە پەڕو باڵەکانی کەدەبینی پەڕو باڵی نەمایە زۆر تکاو رەجا دەکا هاوار دەکا نەکەی ئیقناع ببی تاخوشکی تری دەڕوا ئینجا بیێهێنە ناو قەسرێ لای ئێمەو ئێمەش رازی دەکەین بۆت.

گۆتی باشە چۆنی گۆت وایکرد کە خوشکی گەورە پەڕو باڵێ لەبەر کردنەوە سەیری کرد پەڕو باڵێ خوشکێ گچکە نەمایە لە شەقەی باڵیداو ڕۆیشت فڕی چەند خوشکی گچکە پاڕاوەو ناورایەوە قوربانت بم من بەکەڵکی تۆ نایەم، بەرەڵام بکە کچی ئادەمیزاد زۆرە ئەحمەد گوێی پێ نەدا هاتە ناو قەسرو کچەش لە دویهات کە گەیشتنە لای خوشکان سەیریان کرد ماشەڵلا خودا چی دروست کردووە، جوانی وا لەسەر ڕوی ئەرزی نیە، وەک مانگی چوار دە شەوقدەدا مێوژە سۆر بخوا لە گەردنی دیارە هەتا ناو زگی سۆر دەکرێ. لەلای خۆیان دانا زۆر دڵنەوەییان کرد. گۆتیان خوشکێ ئەمە حەفت خوشکێن ئەو تاقە برایەمان هەیە، دەبی ببیە براژنی ئێمە، هەتا دەمرین خزمەتت دەکەین. ئەو هەر لێیان دەپاڕاوە لۆ ماوەی سێ مانگ هیچ وەعدی پێنەدان پاش سێ مانگان دلێ نەرم بوو رۆژەک لۆیان کردە بەزمو رەزم. ئا هەنگەکی خنجیلانەیان بۆ کرد کردیانە بووک شەوێ لۆ ئەحمەدیان. بردە ژۆرێ ئەحمەد بەمرازی دلێ خۆی گەیشت. بەیانی هەرستان سینی حەلوا بۆ بوک و زاوا رازاوە حەمامیان لۆ گەرم کرد، خۆیان شوشت جلی ئاوریشمیان کردە بەر کچە

وهاتەناویان لێی دانیشت. خولاسە ماوەی یەک ساڵ لەگەر یەک بوون خودا دوو کوڕی دانێ هەندە نازدارو جوان بوون دەتگۆت چرانە. ئەو کۆشک وتەلارە روناک دەکەنەوە.

پاشماوەیەک شەوەک لە شەوان ئەحمەد داکی لە خەودا دیت چاوی کوێر بووە لە ژورێ قەبرەکی لێدایە لە دیار ئەو قەبرە دانیشتیە هەر ئەگریێ ئەحمەد بەیانی هەرستا زۆر عادزو غەمبار بوو گۆتیە خوشکان من دەبێ بڕۆمەوە لای دایکم، ئەوشەو ئەوهام لە خەودیتیە. هەرچەند گۆتیان ئەحمەد خەون درۆیە باوەڕ مەکە چۆن خوشکان لێرە بەتەنیا بەجێدێڵی، گۆتی چارەنییە دەبی بڕۆم.

بۆ رۆژی دوایی خەبەر یاندا مامیان کەشتی هات کەژاوەیان رێکخست ئەحمەد بە خۆیو بەژن و بە جۆتە کوڕەکەی دوعا خوازیان لە خوشکان کردو رۆیشت کەشتی ماوەیەک لە ناو دەریا رۆیشت هەتا گەیشتەوە شارێ ئەحمەدی. لەوێ دابەزین بەشەو چوونە مارێ داکی چاوی کوێربو کەبۆنی ئەحمەدی کرد یەکسەر چاوی چاک بوونەوە، غاریدا دەرێ کەدیتی کوڕەکەی وادێتە ژوورێ باوەشی پێدا کرد، تایەک سەعات هەر بۆنی کرد. پاشان ژنەکەو دوو کوڕە کەشی هەربەو جۆرەکە چونە ژۆرێ دیتی قەبرەک لە ناوەندێ مالێانە گۆتی دایە ئەوە چییە؟ گۆتی رۆڵە ئەمن گوتم ئەحمەد فەوتا ئەمنیش چاوم کوێر بووە لە دیار ئەو قەبرەی دانیشتیمە، بەڵام بەبۆنی تۆ چاوم چاکبووەوە، بەڵام رۆڵە ئەو نافرەتە چیە لەگەڵت تێمان گەیەنە؟ ئەحمەد ماجەرای خۆی هەموو لۆ داکی گێراوە لە سیری هەتا پیازی. گۆتی دایە ئێستاش ئەوە خێزانمە ئەوەش کوڕی م ‌نن... داکی دیسان هەرستا لە باوەشی گرتنەوە ماچی کردن. گۆتی کوڕم بەیانی پاشا ئەو ژنە نازدارەی ببینی لێت دەستێنی لەسەریشت دەدا. هەستە باهەر بەوشەوە بڕۆین، دەچینە شارەکی تر.

هەر بەوشەوە رۆیشتن بۆ شاری (شاهین). لەوێ لە دەرەوەی شاری قەسردکی لێبوو چونە ئەوێ خاوەنی پیرەژنەک بوو لێیان بە کرێ گرت و لێ دانیشتن. پاش ماوەیەک ئەحمەد خوشکی بەبیر هاتنەوە. بەیانی بەدایکی گۆت دایە دەبێ سەردانەکی خوشکان بکەم هیچ خەوفوترسەک لەسەر ئێوە نییە ئەوانیش سەری منیان کرپتەوە بابێ وەفا دەرنەچم لەگەریان، بەڵام بەهیچ شێوەکی نەچنەدەرێ لە مارێ ئەوەش پەرو باری لەناو ئەو تورەگەیە کەس دەستی لێنە داچونکە ئەو بەخۆی ناتوانی دەسکاری بکات ئەگەر یەکەک

یارمەتی نەدات. بەیانی ئەحمەد دوعا خوازی لێکردن رۆیشت لۆ سەردەریا ، لەوێ کەشتی کرێی هەبو سوار بوو تا گەیشتە لای خوشکانی لێی پاڵداوە، ماڵو منالی لە بیر چوو. بێینەوە سەرمەسەلەی ژن و منداڵ و دایکی... ژنی ئەحمەدی لەو چۆل و چۆلەوانیە زۆر غەمبار بوو گۆتی دایە لۆ رۆژەکی نەچینە ناوشاری سەیری باغوباغاتی شاری بکەین لەوێش دەچینە حەمام خۆمان پاک دەکەینەوە. هەرچونێک بوو دایەی رازی کرد چوونە بازاڕو لەوێ بۆ حەمام... ژنی پاشای ئەو رۆژەی لەوێ بوو کەس لەو شارەی لەوی جوانتر نەبوو ئەگەر کەس لە ژنی پاشای جوانتر بائەوە، عادز دەبوو... کەکچەپەری چووە ناو شاری خەڵک دیتی ماشەڵلا خودایە چ بەلایەکە بۆ ئەوشارەی هاتییە خەڵکی شاری بەگەورەو بچووک هاتنە تەماشای ئەو ژنە و ئەو دوو منداڵە... کەچووە حەمامێ خەڵکی ناو حەمام سەیریان کرد رۆژەک هاتە ناو حەمامێ ئەو دەوروبەری رووناک کردەوە. کەژنی پاشای ئاوڕی داوە شۆقەک لەچاویدا کە سەیری کرد ژنەک واله حەمامە ئەو بەکارە کەریشی ناشێ لە جوانی زۆر غەمبار بوو حەمامی بەجێهێشت چووە ماڵێ. دیتی پاشا چاوەڕوانیەتی لە دەرگەی هەتا دێتەوەکە پاشا چاوی پێکەوت دیتی غەمبارە چوەلای، هانازدار لۆغەمباری گۆتی پاشا ئیتر بەمن مەلێ جوان بڕۆژنەک وا لەحەمامە سەیری بکە... پاشا گۆتی کێیە، چ کارەیە؟ شاژن گۆتی من ئەوە یەکەم جارە ئەو شۆخە لێرە ببینم پاشا لەگەل وەزیر بەرەو رێگای حەمام کەوتنەرێ لەسەر رێگاوەستان کەشوخ هاتە دەرێ لەحەمامێ پاشا هەروەختبو سوجدەی بۆ جەمالی ئەو جوانەی ببات یەکسەر لێی پرسی تۆچیت لێرە؟ مێوانی، مالت لێرەیە؟... پاشام خۆشبی ماوەیەکە ماڵمان هاتیتە ئەوشارەی... گۆتی نازداری وەکو تۆ پێویستە لە قەسری پاشای دابنیشی، ژنە گۆتی پاشا ئێمە و پاشایەتی...! ئێمە هەژارین، پاشا گۆتی ئەو شۆخیو جوانیەت لە کوێ هێناوە؟ ژنە گۆتی پاشا ئەمن ئیستا جوان نیم کراسەکم لە ماڵێیە بنێرە بۆمبێ لەبەریکەم ئینجا جوانیم دەبینی. پاشا پیاوەکی خۆی لەگەڵ پیرەژن ناردەمارێ تورەگەی پەڕوباریان لۆهینا کە لەبەری کرد بو وەکۆترەکی سپی باڵنەخشین.

دوو کۆرپەکەی لەباوەش گرتن، گۆتی دایە من خواحافیز بە ئەحمەدی بلێ لە چاوی خۆم خۆشتر دەوێ بابە دوامدانەیێ نامدۆزیتەوە، من پەریمە، پێی بلێ هەردوو چاوی ماچدەکەم. پاشاو وەزیرو خەڵک و پیرەژن واقیان وڕماڵەو

بەسەرهاتەی ئەویش لەشەقەی باڵیداو ڕۆیشت. ئەحمەد لەلای خوشکان ماوە پاش ماوەیەکی شەوێک خەونیدیت دیتی دایکی واچاوی کوێربوەتەوە ئەو جارە چوار قەبری لێدایە دایک و دوو کوڕو ئەحمەد، دایکی دیت لە دیار ئەو چوار قەبرە دەناڵێنی، بەیانی هەرستابە خوشکانی گوت دیسان لە ماڵی من قەوما من خواحافیز سوار بوو هاتەوە بەرەو شاری خۆیان کەسەیری کرد داکی دانیشتیە چاوی کوێر بووە چوار قەبری لێدایەوا لە دیاریان دەناڵێ کەبۆنی ئەحمەدی کرد هەرستا، کەمەک چاوی چاکبووەوە ئەحمەد پرسی دایە چ قەومایە؟ دایە هەموو بەسەر هاتەکەی بۆ گێرایەوە گۆتی چی گوت؟ گۆتی بە ئەحمەدی بڵێ چاوی ماچ دەکەم زۆرم خۆشدەوێ بابە دوامدانێت نامدۆزێتەوە. ئەحمەد دوعا خوازی لە دایکی کردو بەرەو لای خوشکان گەڕاوە. کەدیتیان ئەحمەد هاتەوە هەموو بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕانەوە گۆتیان ئەحمەد گیان هیچ چارەیەک نییە. ئەحمەد گۆتی ئەگەر بشمرم هەردەچم گۆتیان مادام هەردەچی ئێمە لە دومامان دەنێرین بەڵکو ئەو چارەیەک بدۆزیتەوە (ریشوا) چووە سەریان ئاگری کردەوە مامیان کەوتەڕێ لەوێ ئامادە بوو بەسەرهاتی ئەحمەد یان بۆ گێڕایەوە. ئەویش گۆتی کوڕم ئەو ئیشە زۆر زەحمەتە وازی لێ بێنە! کچی کام پاشا داوا بکەی من بۆت دێنم. ئەحمەد گۆتی مامە هەردەچم گۆتی کە وابی کوڕم سواری وڵاخی من بەبڕۆ ئەو ڕێگایە حەفت ڕۆژە ڕێیە، پاشان دەگەیە بەر قەسرو قەڵایەک پیرە مێردەکی کامری لێیە ناوی (پەترۆسە) قەسرەکە دو دەرگای هەیە چاوەڕوانیە هەتا بەخۆی دەرگا دەکاتەوە، دەرگای سپی کردەوە ئەوە ئەمەل هەیە، بەڵام ئەگەر دەرگای ڕەشی کردەوە ئەوە فەوتای. ئەگەر ئەو تەگبیرت بۆبکا چاکە ئەگەر نابە کەس چارەت ناکرێ. گۆتی باشە دەستی مامەی ماچکردو، دوعا خوازی لە خوشکا نکرد ڕۆیشت. حەفت شەو وحەفت ڕۆژان گەیشتە بەردەرگای قەڵا، لەوێ خۆی شاردەوە، سێ ڕۆژی چاوە ڕوان کرد لە ناکاو دەستەک هات دەرگای سپی کردەوە. ئەحمەد زۆر شوکرانەی خوای کرد، کەیف خۆشبوو کەدەرگای سپی کرایەوە، پیرەمێردەکی نورانی هاتە دەرێ گۆتی ڕێبوار دەزانم برادەری من ئەتوی ناردیە، بەڵام بزانم چ فەرمانت هەیە؟ وەرە بۆم بەیانکە ئەحمەد وەک شێرهاتە پێشی سەلامی لێکردو دەستی ماچکرد. گۆتی مامە بەسەر هاتم ئەوەیە... گۆتی ڕۆڵە دەردت زۆر گرانە چ چارەیەک نییە بگەڕێوە. گۆتی سەرەکم هینایە و نایگێرمەوە گۆتی کوڕم لە

پاش ئەو دوو دەرگەیە ولاتی جن دەستپێدەکات ئەتوانی بچیە ناو خاکی ئەجندان، گۆتی هەردەچم، گۆتی کەواتە کورم کە لەو دەرگایە دەچیە دەرێ ئەو توولە ڕێیە بگرە، بەڕێەدە هەرچی دیتت ئاوڕی لێمەدەوە تا دە ڕوز دەڕۆی دەگەیە باغوباغاتەکی لەوێ داکە دێوەک لەوێیە دەرسی (٧٠٠) قوتابی دەدا، شەویش جن حەرەسی دەکەن بەخۆی لەناو قەسر دەنوی ئەگەر توانیت بگەیە ناو قەسرو لەو حەرەسانە دەربازببی بڕۆ خۆی باوێ بەرمەمکی، هەرچەند بلێ بڕۆ ئەترسیی بلێ تابە کوڕی خۆم قبولێنەکەی ناڕۆم، ئینجاکە گۆتی قبولم کردی، بلێ ئەو داوایەم هەیەو بۆم جێبەجێ بکە. ئەگەر ئەو چارەت بۆ نەکا بەهەموو دونیا ناکرێ. گۆتی باشە.

دوعا خوازی لێکردو چۆنی گۆت وایکرد. بەرەو قەسر ڕۆیشت شەو سەرکەوتە سەربان و خۆی فڕێدا ناو تەلارکە دیتی پیرەژن وا لە ناوەندی قەسر لەسەر چارپایەک لێنوسیتە دەرگای هەمووی حەرەسە ناوی خوای لێ هێناو چووە ژوورێ کەس بەخەبەر نەهات تاگەیشتە سەرسەری پیرەژن، خۆی هاویشتە بەرمەمکی دەستی کرد بە مژینی کە پیرەژن بەخەبەرهات دیتی وا بنیادەمێک مەمکی دەمژی... گۆتی بنیادەم چۆن گەیشتیە ئێرە؟ گۆتی بەرێگادا، گۆتی مەمکم بەردە، گۆتی هەتا بەکوڕی خۆم قەبوولێ نەکەی مەمکت بەرنادەم. زۆری لەگەر کرد گۆتی بەرنادەم، گۆتی هەستە بەکوڕی خۆم قەبولکردی چت مەرامە بلێ؟ گۆتی ئەوەیە بەسەرهاتم هەمووی لەسیر هەتا پیاز لۆ گێڕاوە. گۆتی باشە ئەو شەو لە ناوباخ بخەوە بەیانی چارەیەک دەکەین. ئەحمەد وەعدی لێوەرگرت چووە ناوباخ و لێی پارداوە بەیانی کە لەخەو هەستان (٧٠٠) قوتابی لە دەورەی پیرەژن کۆبونەوە پیرەژن بانگی کرد ئەحمەد وەرە. ئەحمەد هاتە دەرێ لە ناو باغی، گۆتی ئەحمەد لەوانە کامیان هەوە هەتا تەسلیمت بکەم بڕۆی. ئەحمەد تەماشای کرد یەکیان ئەو نەبوو. گۆتی ئەحمەد دەنا خواحافیزت بێت چم پێناکرێ... شەو دیسان چووەوە بەرمەمکی گۆتی ئەحمەد، وازم لێبینە، گۆتی کوڕ چۆن واز لەداکی دەینی. گۆتی ئەحمەد بڕۆ بەیانی چارەیەک دەکەین بەیانی پیرەژن قوتابیەکانی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پشودان گۆتی سێ چوار ڕۆژکارەکم هەیە پاشان دێمەوە گۆتیان باشە. پیرەژن گۆتی ئەحمەد ئەوە کچی پاشای پەریانە لە ولاتی (خەتا) دەبی بچینە ئەوێ بەلام من ناتوانم بێمە ناوشار لە دەرەوەی شار چاوە ڕوان دەکەم

تاسێ رۆژان ئەگەر نەهاتیەوە من دەگەڕێمەوە، ئەحمەد گۆتی باشە. داکە دێوفڕی و ئەحمەدی سواری گەردنی خۆی کرد بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە تاحدودی ولاتی (خەتا)، لەوێ لەسەر کێوەک دابەزین. گۆتی ئەحمەد ئەوە شارو ولاتی (خەتا)، ئەو قەسرە بەرزە قەسری پاشای پەریانە ئەوەی تەنیشتی قەسری یارتە ئەوەی دەستە راست قەسری کچی گەورەیە یارت لەوێ سجنە ئەگەر توانیت دەری بهێنی ئەوە منیش لێرە دەربازتان دەکەم. ئەگەر هەتا سێ رۆژ نەتتوانی بیهێنی ئەوە من دەڕۆم. ئەحمەد خەنجەرەکی پێبو بە تەنها لە چیا چوە خوارێ کەوتە بیابان تا نزیکی شەونە چووە ناو شاری خۆی شاردەوە. کەشەو داهات بەرەو قەسری کچی گەورە کشا، کە چووە ناو قەسر لە پەنایەک لێرا مادیتی کچی گەورە هات قەمچیەکی رەشی لە دەستبوو بەرەو ژوور کشا دەستی کرد بەلێدانی کچی گچکە. ئەحمەد لە پەنایەک تەماشای دەکا هەر لێی دەدا دەیگوت ئەگەر قەحپەنەبای قەت خۆت تەسلیمی بنیادەمان نەدەکرد، دەبی بەو دەردەی بتکوژم. سەرەوبن هەڵوا سرابوو هەتا خوێن لە لەشی رۆیشت هەر لێیدا ئینجا رۆیشتە دەرێ. ئەحمەد دەیگۆت واچاکە ئەمشەو خۆم ئاشکرا نەکەم. ئەحمەد گوێی لێبو خۆشەویستەکەی هەر هاوار هاواری بوو دەیگوت، ئەی ئەحمەد بریا هەر لەلای تۆ کارە کەر بام بەس نەکەو تبامە دەست ئەو زاڵمەی. ئەگەر پیاوبی ئەوەشەش مانگە چۆن نایەی بە دوامدا سۆراخەکم بکەی، ئەحمەد لە دلێ خۆی گۆتی ئەمشەو خواحافیز بۆ شەوی دووەم هەروا ئەوە کاری بوو دیسان خۆی ئاشکرانە کرد رۆیشتەوە قەراخی شار بۆ رۆژی سێیەم لەقەراخ روو بارەک ئەحمەد پیاسەی دەکرد دیتی ئەوە دوو کەس شەڕیانە لێک دەدەن ئەحمەد چووەلایان گۆتی برایان بۆ ئەو هالێک دەدەن و شەڕتانە! گۆتیان کاکە ئێمە دوو براینە بابمان مرد ئەو دووشتەی بۆ مەبە جێهێشتیە یەکیان کلاوی (سەخرە جنە) یەکیان دارعەسای حەزرەتی (سولەیمانە) من دەڵێم کلاو بۆ تۆ دارعەسا بۆ من ئەویش دەڵێ نادارعە سابۆ من کلاو بۆ تۆ. گۆتی ئەوانە چنە بۆ چی باشن؟ گۆتیان ئەگەر کلاو لە سەری بکەی ئەبی بە جن و کەس ناتبینی، ئەگەر دارعەسا لە دەستت بێ ئەبیتە پاشای حەفت مەملەکەتان لەدلێ خۆی گۆتی شتەکی باشە. گۆتی کاکە ئەمن رێتان بۆ دادەنێم... دوو بەرد دوور دەهاوێم کامەتان بەردی خۆی زووتر هێناوە، ئەوە کامەیان باشە دەدەمە ئەو، من نازانم کامیان باشەو کامیان

خراپە. گۆتیان وەلاهی تەگبیرەکی چاکە ئەحمەد دووبەردی فرێدان هەریەکەک چوو بەردی خۆی بێنیتەوە. ئەحمەد گۆتی بابزانم وایە کلاوی کردەسەری و لەوێ ڕاوەستاکە گەڕانەوە دیتیان کەس لەوێ نییە. ئەدی کابرا چی لێهات؟ بەخوای ئەویشمان چوو ئەویشیمان چوو ئەویش فێری خۆی لێکردین. ئەحمەد بەو نیوەڕۆیە رۆیشتە ناو شار بەسەر کەوتە ناو قەسر کە دیتی دوو مندالەکانی یاری دەکەن، کلاوی لابرد خۆی نیشانی دوو کوڕەکانیدا کوڕەکانی غاریاندا لای دایکیان... ئەی دایە بابمان هاتەوە کلاوەکەی کردە وەسەری لە پیش چاویان بزر بوو جارەکی دی کلاوی لابرد گوتیان ئەی بابمان هات. دایک گۆتی رۆلە دانیشن قوڕبەسەری داکتان بابە لەکوێ دەگاتە ئێرە. ئەحمەد گۆتی ئافرەت والێرە مەچەندم خۆشدەویستی چەند بەقەدر بووی لەلام بزانە هاتیەوە حالت چۆنە ئێستاش دەتکەمەوە، بەلام دەڕۆین گۆتی زوو بەبمەکەوە. ئەحمەد لە داری کردەوەو کلاوی کردەسەرو دوو مندالەکەی لەباوە شگرت لە شار چوونەدەر. بەرەبەری مەغریب بووکە دیتی دێو خەریکە بڕوات بانگی کرد کە ئاوڕی داوە دیتی ئەحمەد هاتەوەو ژن و مندالیشی هێناوە داکە دیو پیرۆزبایی لێکرد هەمووی سواری گەردنی خۆی کردن بەرێکەوتن بەرەوباغ... لەوێ دەستی دێویان ماچ کردو بەرەو لای (بەترۆس) ئەویش پیرۆز بایی لێکردن ئەویش بەرییێکردن. شەوداهات لەڕێ ئەحمەد گۆتی بائەم شەو لێرە ئیسراحەت بکەین... لێیان پالداوە شەو درەنگ هاڕەیەک هات لە عاسمانێ کەسەیریان کرد دێوەکی سپی سپی هات. گۆتی: ئەحمەد چەند سالە لەلای کچی پاشای فلان شار کە حەفت خوشکن رادەبوێری نازانی ئەوانە یاری منن، ئیستاش لە مەملەکەتی پەریان دێیتەوە لە دەست جن و پەری دەرباز بووی لەدەستی من دەرباز نابی دەتکوژم... ئەحمەد گۆتی گوبخۆ کافر! ئەوانە خوشکی منن ئیستا چارەی تۆشدەکەم. دێوی سپی هێرشی کردە سەر ئەحمەدی ئەویش خەنجەری هەر کێشاو لەزگی دێویدا لە پشتی دەرچوو کەوتە سەر زەوی... بەیانی ئەحمەد لەگەڵ خێزانی و کوڕەکانی رۆیشتن تاگەیشتەوە لای خوشکان. لەوێش مامی کچەکان و بابێ کچەکان هات گۆتیان ئەحمەد کو دێوی سپیت کوشت ئێمەش لە ترسی دێوی سپی ئەو کچانەمان لەو چۆلیەی دانایە ئیستاش دەیانبەینەوە.

هەموو پێکەوە هاتنەوە مالێ بابی کچەکان هەفتەک لەوێ بوون ئینجا بەتە

دارەکی پاشایانە بەرێیانکردن تاشاری (شاهین) قوەتی لەگەڵ ناردن کە چووە بەردەرگای مالّیان دیتی داکی کوێر بووە، چوار قەبری لێدایە لەدیار ئەو قەبرانە دەگری کە بۆنی ئەحمەدیکرد چاوی چاکبونەوەو هەمووی گرتنە باوەش، لەوێدانیشتن. ئەحمەد گۆتی: دایە من دەچم بۆشاری خۆمان قەشەی دەکوژم زوو دێمەوە. دایکی گۆتی برۆ کورم. ئەحمەد رۆیی چووە شاری خۆیان. قەشەی دیتەوەو کوشتی و گەراوە دار عەسای گرتە دەستی کەسەیری کرد پاشای شار بە خۆی و لە شکرەوە ئامادەبوو تاجی لەسەرهێنایە خوارو لەسەری ئەحمەدی کرد. ئەحمەد گۆتی پاشا ئەو تاجە هەر قابیلی تۆیە من پاشایەتم ناوێ... لەلای دی لە شکرەک و پاشایەکی ترهات هەتا حەفت مەملەکەتی دەوروبەری هەموو پاشاو لە شکر هاتن تاجیان فرێدا گۆتیان تۆ پاشای، ئێمە غولامین... ئەحمەد تاجی کردوەوە سەرسەری هەموان گۆتی من پاشایەیتم گەرەک نییە مووبارەکی خۆتان بێت... پاشایەکان دەستیان ماچکردو گەرانەوە بە خۆشی لەو شارەی لەگەڵ ماڵ و منالّی خۆی لێیدانیشت. منیش هاتمەوە کارەشم دراو چم پێنە برا...

*** تێبینی: ئەو هەقایەتەم لە سالّی ١٩٨٢ لە گوندی (بالیسان) لە کاکی جوانە مەرگ (یوسف دەشتەکی) گۆی لێ بوومو نووسیمەوە.**

هەبوو نەبوو پاشایەک هەبوو دوو ژنی هەبوو ژنێ گەورەی کورەکی هەبوو ناوی (ئەحمەد) بوو ژنێ گچکەش هیچ منداڵی نەبوو... رۆژەک ژنی بچووک بە پاشای گۆت پاشا ئەتۆ لۆخەمەکی لەمن ناخۆی یاچارە یەکم لێ ناکەی، لە ژنی دی کورەکت هەیە ئەگەر تۆ مردی ئەوان خۆی و دایکی دەبن بەدەسەڵاتدارو منیش فڕێ دەدەن هەتا بە خێویشم ناکەن... پاشا گۆتی ئافرەت چارە لەدەست خوایە هیچ لەدەست من نییە ئەگەر خوانەدا تاوانی من چییە؟ رۆژەک لە رۆژان دیتیان مام دەروێشەک هاتە بەردەرگای ماڵی پاشا... گۆتی بابێتە ژووردوە... کە دەروێش هات و دانیشت و ئیسراحەتی کرد و نانی لەلای پاشا خوارد پاشا گۆتی مام دەروێش دوعایەکم لۆبکە لە ژنی گچکە منداڵێکمان ببی دەروێش گۆتی پاشام خۆش بی من دوعا دەکەم! بەڵام خوا دەیدا بەدەستی عەبد نییە. دەروێش سێوەکی لە باخەڵێ دەرهێناو کردیە دوولەت لەتێکی دایە پاشاو گۆتی پاشا ئەوەی تریش باژنی بچووکت بیخوات، بەڵام پاشا ئەگەر منداڵێکتان بووناوی لێ مەنێن چ کور بی چ کچ بی منساڵێکی تر ئەو وەختە دێمەوەو ناوێ لێ دەنێم بەتەمای خودا. دەروێش بەیانی رۆیشت پاشاش لەتە سێوێکی بەخۆی خواردو لە تەکەی دیکەی دایە ژنە بچووکەکەی، پاش دووسێ مانگی رۆژێک کارەکەرێک هاتە لای پاشاو گۆتی پاشام خۆش بی مزگێنیم دەوێ ژنی بچووکت حامیلەیە پاشا مستە زێرەکی مزگێنی دایە و بوو بە شایی و بەزم و سەیران... کات رۆیی بەرەبەرە تا نزیکی ولادەتی داهات ژنەکە لە ناو قەسر بوو ژنی گەورە لەلای مامان بوو کەسی تری لەلا نەبوو کە ژنەکە منداڵی بوو ژنە گەورەکە دیتی منداڵێکی بووە کوڕ وەک مانگی چواردە شەوق دەدات وتی بەخوا ئەوە گەورە ببی دەبی بە پاشاو کوری منیش دەبیتە نۆکەری دایکیشی دەبێتە ئاغا ژن پێویستە چارەیەکی لێ بکەم بانگی کارە کەرێکی کرد گۆتی وەرە، شێرێکیان لە ناو باخی هەبوو چەند ساڵ بوو لەوێ بوو فەرخەی دەکردن لانەی هەبوو ژنە گەورەکە بەکارە کەری وت برۆ ئیستا شێر

نووستــووه ئەو مـەلۆتـكەيە لە ناو پارچە پەرۆيان لول بدەو بيـخـە ناو لانەى شێرى كەشێر بەخەبەر هات دەرخواردى فەرخەكانى دەداو بێچووە سەگەكيش بۆ من بێنە لەگەڵ خۆت. كارەكە رەكە چوو مـەلۆتـكەكـەى بەدزى هاويشـتـە ناو لانەى شێرى و گوجيلە سەگەكى بۆ ئاغا ژن هێناو ئەويش بێچووە سەگەكەى دانا ناو جێگاى ژنى گـچكە بەيانى بە دزى بانگى پاشاى كـردو گـوتى پاشا ژنى گچكەت بێچووە سەگەكى بووە لە جياتى منداڵ وتى وانيە وتى وەرە بە چاوى خـۆت ببـينە كـە پاشا چوو تەمـاشـاى كـرد ديتى وايە... پاشـا بە دزى بانگى شازادە ئەحمەدى كرد گۆتى ئەحمەد ئەو ژنە ببەو لە جێگايەک بيكوژەو مەيەڵە كەس بزانى... گۆتى بەڵێ بابە ئەحمەد هەستا و زرداكى خۆى بردەكونە خانويەک و دوو كـارەكەرى بۆ دانا كە بەدەوام خزمەتى بكەن و جلى بە خوێنى بۆ پاشا بردەوە و گۆتى پاشا كوشتم گۆتى زۆر چاكە.

بێينەوە سەر باسى مەلۆتكەكە كە شێر بەخەبەر هات ديتى مەلۆتكە يەک لە ناو پەڕۆيان لەبەر دەمـيـەتى يەكسەر لە پێكى لێداو خستيە بەرمەمكى خۆى كـەدەچووە دەرەوە بۆ لەوەڕ لەگـەڵ بێـچـووەكـانى لە دەمى خـۆى دەگـرت كـە دەگـەڕاوە هەربەو شـێـوەيە... چەند ڕۆژێـک وا بوو باغـەوان ئاگـادار بوو كـە مـەلۆتـكەيەک لە نـاو دەمى شـێـرە كـاتـى دێ و دەڕوا، بەڵام هەرگـيـز نەيدەوێرا قـسـە بۆ پاشـا بكات هەر دەيوت زۆر سـەيرە ئەو مـەلۆتكەيە چيـيـە؟ شـێـر وا بەجوانى خزمەتى دەكات... پاش ماوەيەک كەتەمەنى بوو بەهەشت نۆ مـانگ منالێكى خر پن ئازاو چاو نەترس يەكە يەكە فـەرخە شـێـرەكانى دەبەزاند شێر دەڕۆيى ئەويش بەگـا گـۆرە بە دواى دەكـەوت هەركـاتى مـاندوو دەبوو شـێـر بەدەمى هەڵێ دەگرت. ئيوارە يەک دبيـتيـان مام دەروێش لەبەر دەركى قەسرێ پاشاى پەيدا بوو پاشا گۆتى مام دەروێش بگرن و لە سێدارەى بدەن ئەوە دوعا بوو لۆمنت كـرد مـام دەروێش...! بۆ من باب كوشتـەى تۆ بووم دەروێش گۆتى پاشـام چ بووە؟ گۆتى دەروێش بەدوعـاى تـو فـەرخـە سـەگـەكـمـان بووە دەروێش گۆتى پاشا خۆت سەخڵەت مەكە هەموو شتەک ئاشكرا دەبى تۆ فەرخە سەگت نەبووە بەڵام ئاخ وتى ئاخى چى مـام دەروێش... دەروێش گۆتى پاشـام بانگى دەرگەوانى باغى بكەو هەمووشتى لێ بپرسە بزانە چى ديتيە؟ كـاتى بانگى باغــەوانيـان كـرد باغــەوان وتى پاشــام خـۆش بى ئەوە دە مــانگە شـێـر مەلۆتكەيەكى لە بەرەو وەک بێچووەكانى خۆى خزمەتى دەكات و شيرى دەداتێ

ئیستا گەورە بووەو بەدوایدا دەڕوا پاشا گۆتی مام دەرویش ئەم سرە چییە؟
گۆتی پاشام خۆشبی هیچ سرِی تێدانیە تەنها لەکاتی منداڵ بوون ژنە بێهۆش
بووە ومنداڵەکەیان لێ دزیوەو فەرخە سەگیان خستۆتە بەری وە ژنی گەورەشت
وای کردووە کەسی ترنا... پاشا بانگی شازادە ئەحمەدی کرد گۆتی ئەحمەد تۆ
بەخۆت و دایکت واتان بەمن کرد ئەحمەد گۆتی بابە بەخوای من ئاگادارنیم
بەڵام وادەچم دایکیشم دەکوژم... ئەحمەد چوو دایکی خۆی بردە جێگای ژنی
گچکە و ژنەکەشی بەدزی هێناوە لای خۆی لە قەسرێ خۆی دایناو گۆتی پاشا
هەر دوکیانم کوشت... پاشا وەزیری کۆ کردنەوەو تەگبیریان کرد چۆن ئەم
منداڵە لە شێر بسێتننەوە گوتیان پیویستە شێر بکوژین... پاشا گۆتی نابی،
گۆتیان پاشا کەس ناتوانی ئەم بێچووە لە شێر بسێنی پاشا وەزیرەکی زۆر
زانای هەبوو وتی پاشا قۆرتەکی بچووک لێدەن و بە پووش و پەڵاش داپپۆشن
کەشێر تێپەڕی پێچووەکەی لە دوایە دەکەوێتە ناو چاڵەکەو دەیگرین، گوتیان
زۆر باشە... بەیانی چاڵیان لێداو شێر بازی لەسەر هەڵداو بێچووکە لەدوای
بازی هەڵدا، بەڵام نەپەڕیەوەو کەوتە ناو چاڵەکە و شێر ئاوڕی نەداوە
ئەحمەدیش منداڵەکەی هیناوە... وەزیرەکە گۆتی بڕۆن لە ئەشکە وتەک
بیشارنەوە ئیستا شێر ئاوڕ بداتەوە کە منداڵەکەی لەدوونیە یەکسەر شارولێ
سەروابن دەکات منداڵەکەیان گەیاندە ناو ئەشکەوتەکی... کەشێر ئاوڕی
دایەوە منداڵەکەی لە دوونیە دەرگای باغی شکاند کەوتە ناو شاری ماڵ بە
ماڵ دەگەڕاو دەینەڕاند، بەڵام بێ سوودبوو، پاشان بە ناچاری گەڕایەوە ناو
باغەکە پاش حەفت شەوو حەفت ڕۆژ منداڵەکەیان هێناوە قەسرێ پاشاو
دەرویش گۆتی پاشام سەلامەت بی من واناوم لێ نا (شێرزاد) هەموو لایەک
بەناوەکە ڕازی بوون... دەروێش گۆتی خواحافیز... پاشا وتی ئەلحەمدولیللا
بێچووەکی پاشا زادانەم هەیە، بەڵام بە داخەوە داکی بەلاش کوژرا ئەحمەد
گۆتی پاشام خۆش بی دایکم نە کوشتیە گۆتی ئەدی کوا وتی هەر ئیستا
دەیهێنم چوو یەکسەر دایکی هێناو هەموو لایەک پێک شاد بوونەوە بە ماوەی
سێ چوار مانگ هەتا کوڕەکە خولقی کەتەوە سەر دایک و باب و برای خۆی
بەرەبەرە شێرزاد گەورە بوو پاشا چەند مامۆستای تایبەتی بۆ ڕاگرت هەموو
نەوعە دەرسێکیان فێردەکرد لە تیرو شیرو ڕمبازی و کەمەندومل مەلانێ
سەرەڕای خوێندەواری تاتەمەنی بووە دوانزە تا سێزدە ساڵ کەس نەبوو لەو

مەملەکەتە ملی بگری لە هەمووشتەک بوو بە پاڵەوان لە جوانی و سوار چاکی و مەعرفەتدا هاوتای نەبوو... ڕۆژەک ئەحمەد گۆتی برام تۆ واتە مەنت بوو بە چوارده پانزه ساڵ بۆ ڕۆژەک نەچین بۆ ڕاووشکار بۆ ئەو دەشت و دەره؟ شێرو گوتی دەچین... ئەسبابی ڕاویان تێک ناو لەگەڵ غولامان ڕۆیشتن تا گەیشتنە چۆل و بیابان و خیوەت و خیوه تگایان هەڵدا لەسەر ئاوەک لێی دانیشتن... ئەحمەد وتی برام من زۆر ماندووم کەمێک دەحەسێمەوە تۆ بڕۆ ئەو دەورووبەرد ڕاوی خۆت بکەپاشان منیش بە دواتدا دێم گۆتی باشه... شێرزاد ڕۆیشت بۆ سەرکێوە کە سەرکەوت هەر ئاوڕێشی لەلای خیوەتی برای دەدایەوە کاتەک دیتی واشتەک لە پشت خێمەی برایەتی پرچی لەبەری پێیانە هیچ لەشی دیارنیە نە یزانی نە مرۆڤە نە (جننە) ڕکێبەکی لە ئەسپیداو گەیشتەوە نزیک خێمەی ئەحمەدی برای کە لەپشت خێمە ڕاوەستا گۆیی لێگرت ئەحمەد لێی دەپرسی باشە تۆ جننی، عفریتی، بەشەری. چی، وابە و پرچە خۆت داپۆشیوە ئەویش دەڵێ من بەشەرم وەک تۆ کوڕە پاشامە ئەگەر تۆ پاڵە وانێکت هەبێ من سەدم هەیە تۆ هەزارت هەبێ من دە هەزارم هەیە... ئەدی باشە بۆ وات لێهاتووە من عاشقم... عەشق وای لێکردووم... ئەحمەد قاقا پێکەنی گۆتی سەگباب عاشقی بەخۆت و ئەوسەرو مەنزەرەوە!؟... وتی ئیستا گەرنانەکم ئەدەیێ بمدێ ئەگەرنا دەرۆمە ڕێگای خۆم من پاڵەوان بووم پاشا بووم ماڵ و موڵکی خۆم هەموو لەسەر ئەو کچە دانا من عاشقی (ماهی ئەفرۆزەم) کچی پاشای مەغریب زەمین بەدوایدا چووم تەنها وێنەیەکم دەسکەوت ئیستاش کاتێ ئەو وێنەیە دەردێنم لە گیر فانم پێدەکەنم کە هەلێ دەگرمەوە دەگریم وتی دەبی ئەو وێنەیەم پیشان بدەی ئەگەر نابەو شمشێرە سەرت دەبڕم ئەویش وتی کاکە من خۆم فەوتاند تۆش باوەکو منت لێ نەیێ وتی نابی... کە کابرا وێنەکەی لە گیرفانی دەرهێناو ئەحمەد چاوی پێکەوت یەکسەر ئەحمەد وەرگەڕاو کەوتە سەر زەوی شێرزادیش واله پشت خێمەی ئاگادارە... یەکسەر کابرا لە لایتر لە خێمە دەرپەڕی و شێرزاد پێی نەگیرا... هاتە سەر سەری برای. ئەی برا ڕۆ ئەی کاکە ڕۆ بۆ وات لێ هات؟ گۆتی شێرزاد ناتەواوم ڕاوەکە بە تاڵکە با بڕۆینەوە... ڕۆیشتنەوە ئەحمەد تا دەهات لاواز و ڕەنگ زەرد دەبوو بەماوەی دووسێ مانگ وای لێ هات بەلۆکە ئاویان دەدایێ... حەکیم و تەبیبی ولاتیان گشتی کۆ کردەوە هیچ چارەی نەبوو تەنها شیرزاد

چارەی دەزانی... شەوەک شێرزاد چووە لایی و وتی ئەحمەد برام دەردی دلێ خۆت بەمن بلێ، گۆتی هیچ نیە، شێرزاد گۆتی چارەت بۆ دەکەم ئەگەر گیانی خۆشم لەسەر دانابی... رۆژەک شێرزاد گۆتی ئەحمەد تۆ لەگەلم دیێ بۆ (مەغرب زەمین)؟ گۆتی دێم، گۆتی چاکە شیرزاد چوە لای دایکی و گۆتی دایە ئێمە دەرۆین ئەسبابی سەفەرم بۆ ئامادەبکە هەر چەند دایکی لێ پاڕایەوە بەلاش بوو، ناچار دایکی ئەشیای سەفەری بۆ حازر کردن و ولاخی زین کرد و پاشکۆی زینی پری زێر کردو شەوێک لەشەوان ئەحمەدی خستە پێش خۆیی و بەتەنیا لە شار چوونەدەر... چەند شەوو چەند ڕۆژێک رۆیشتن کاتی ماندوو دەبوون دا دە بەزین و خواردنیان دەخواردو ئاوی بە لۆکەی لە دەوی ئەحمەد دەکرد پاش چەند ڕۆژیک لە چیایەک شۆڕ بوونەوە دیتیان چوار باخێکە لەناو گەریەکە هەموو تەعاماتی دونیای تێدایە لێی دابەزین و ئەحمەدی خستە سەر گژوگیاو دەستی گەیاندە چەند دەنکە ترێیەک و گوشیە ناودەوی لە ناکاو هارەیەک لە ئاسمان هات کەسەیری کرد دێوەک هاتە خوارێ تەو رزینەکی لە دەست بوو ئەگەر لە کێوی ئە لبورزی بدا باشەقی دەکرد، گۆتی ئەوە چیە وابێ ڕوخسەت هاتیە ناو باغ و باغاتی من تۆ نازانی بالدار بەسەر باغی من تێبپەڕی بالێ دەشکێنم.

نالدار تێبپەڕی نالێ دەشکێنم، شێرزاد گۆتی مەلعون چەنە چەنی پێ ناوێ وشیە ترێ یەکم خواردیە حەقت چەندە تابتدەمێ دێوە هێرشی بردەسەر سەری شێرزادو تەورزینەکی لەسەری دائەو شیرەی بە مندالێ خوارد بووی لە کونە لوتی هاتە دەرێ، ئەگەر خوانەپیاراستبا یەکسەر شەقی کرد بوو شێرزاد گۆتی هەی کافر ئەوە لۆ وات کرد گرتی و خستیە سەرسەری و بلندی کرد و سووڕاندی چەند جار ئینجا بە عەردی دادا یەکسەر دێو تەسلیم بوو، شێرزادیش سوێندی خواردبوو هەرچی لە ڕێگا بیگرم نایکوژم ئەیبەخشم دێو ئیمانی بە شێرزاد هێناو وتی لەگەلت دێم من ناوم (ئەکوانی) دێوە وتی مەغربستانی پێدە زانی وتی نا ،بەلام برایەکی ترم هەیە ئەو لەوانەیە پێ بزانی چوونە لای ئەو ناوی (ئیمکانە) بوو ئەویشیان گرت و بە گەریان کەوت ئەویش وتی نازانم ئەگەر برای ترمان بزانی ئەویش ناوی (ئەسغەرە) بوو، چوونە لای ئەویش وتی نازانم، رۆیشت هەرسێ دیوێشیان لەگەلدا بوو رۆژەک گەیشتنە باغ و باغاتەکی تر بە هەشتی سەر ڕووی زەوی بووکە گەیشتنە نزیک

باغەکە هەرسێ دیۆکە دەستیان بە لەرزین کرد و ڕاوەستان، (شێرزاد) ئێمە ناوێرین لێرە زیاتر بێین ئیرە باغی یەکەکیە نیقابەکی ڕەشی پۆشیە ڕەخشەکی ڕەشی لەبنە چەند سالە لێرە غەزریە بالدار بە بالدارەتی خۆی ناتوانی لەو مەکانە تێبپەڕی ئەسغەرە گۆتی ڕۆژێکیان ئێمە بێرەدا تیپەڕین (٨٠) دێو بوین بەخەدەنگ و تیروکەوان کەوتە دومان لە هەشتایان پێنجمان بە سەلامەتی دەرچوین ئەوی تری هەموو کوشتێ... شێرزاد گۆتی مەلعون ئیمانت بەخوا قایم بی کاتی ئێمەی کوشت ئێوە بلێین ئەسیرین ناتان کوژی بەهەر حال بە گەری کەوتن هاتنەناو باغ و باغات گەیشتنە بەردەرگا دیتیان دەرگایەکی پۆلابەندە داخراوە بەسەد پالەوان ناکرێتەوە شێرزاد یەکسەر ناوی خوای هێناو دەرگەی لەبنەوە دەرهێناو دووری فرێدا... لەو دیوی دەرگا دیتیان هەمووی هۆدیەو لەشاخ براوەتەوە ئەو قەسرو قسورە هەمووی بە بەردی مەڕمەڕو کافووڕ ڕازاوەتەوە، شێرزاد ئەحمەدی دابەزاندو لە ناوگیاو کولوک و پونگ درێژی کرد هەر نەخۆشە ئەحمەد لە ناکاودیتیان دەنگی پێی ولاخەکی دێت کە ڕوانیان ولاخەکی ڕەشە سوارەکی ڕەشپۆ شەعەرزی وەکو بۆ مەلەرزە لە بن پێی دەلەرزی هاتەلایان و سەلام و عەلیکم، شێرزاد جوابی سەلامی داوە نەیپرسی ئەو دەرگاو بانە بۆ وای لێکراوە زانی پالەوانە گۆتی یاخوا بەخێربێی مێوان ئەوە هەر بەخۆت و بەونەخۆشەی گۆتی نەخێر سێ دێویشم لەگەلە بانگیان کردن دێو لەترسان دەلەرزین نیقاپۆش گۆتی سەگبابینە ئێوە هەر تەمێ نەبوینە ئەوێ ڕۆژی من بەدوتان کەوتم چەندم لێ کوشتێ دیارە نابنە پیاو دێوەکان گۆتیان بەخوا پاشا بەزۆر ئێمەی هێناوە ئێمە ئەسیرین، چێشتیان بە زوترین کات ئامادە کرد نانیان خوارد ئەو شەوە لێی نوستێ بەئیسراحەت بەیانی نیقاپۆش لێی پرسی پالەوان زادە سەربردەی ئێوە چییە بۆ کوێ دەچن؟ تۆ ناوت چییە؟ گۆتی پالەوان ئێمە ڕێبوارین ئەوە برامەو نەخۆشە ڕێمان ئەوشەو کەوتە ئیرەو بەخزمەتی جەنابت شادبوین و ئێستاش ئەگەر ڕوخسەت بێ دەڕۆین. نیقاپۆش گۆتی مێوان بەخێربێن سەرچاو شێرزاد دوعا خوازی کردو سواری ولاخی خۆی بوو نیقاپۆش گۆتی پالەوان زادە کامەتان خەرجی من دەدەن کەس لە جێ و مەکانی من بێ خەرجی تێنا پەری. خەرجی بەمانای شەڕە...! شێرزاد دابەزی و گۆتی ناچار من خەرجی دەدەم... نیقاپۆش بانگی دێوەکانی کرد گۆتی وەرن مەلعونینە من و ئەو پالەوانە شەڕدەکەین یەک ئەوی

تردە کوژبن ئێوە بەهەرسێکتان سێ جەمە چێشت و نانمان بۆ حازر دەکەن پاشان خزمەتی ئەو نەخۆشە دەکەن نەخۆش زویر ببی یا بێ خزمەت بی دەتانکوژم نەکەن فکری فێراکردنیش بکەنەوە ئەگەر بچنە مەملەکەتی ئەجندانیش دەتان گرمەوەو دەتانکوژم شێرزادیش گۆتی ئەگەر بچنەپشت قوللەی قافیش من دەیان دۆزمەوە جابۆ خۆتان دانیشن سەیری شەڕو ئەنجامی شەڕ بکەن نیقاپۆش گۆتی من ئەم پالەوانەش بکوژم ئیوە مەترسن ناتان کوژم وتیان بەڵێ بەسەرچاو نیقاپۆش گۆتی وەرە پالەوان زادە بەدوامکەوە شێرزاد لە دوای رۆیی چوونە پێش دەرگایەک دەرگای کردەوە شێرزاد دیتی ئەو ژوورە وەکو قاعەیەکی هەمووی گورزە گۆتی پالەوان زادە بە چ شەڕ بکەین گۆتی بە هەرچی تۆ هەوەست لەسەرە دەیکەین... نیقاپۆش گۆتی ناوت بلێ پالەوان گۆتی ناوم (شێرزادە) ئەوە برامە (ئەحمەد) عاشقی (ماهی ئەفرۆزەی) کچی پاشای مەغربستان بووە دەچم بۆی دەهێنم ئەگەر من لەسەر رێ سوجدە بۆ بتی تۆببەم و نەتوانم تۆ ببەزێنم چۆن دەگەمە مەغربستان گۆتی قوربەسەری خۆت و عەقلت (ماهی ئەفرۆزە) بە منالێکی وەکو تۆدێت بۆ ئێرەو بیکەی بە بووک بۆ برات گۆتی باتۆببەزێنم، بەلام پەیمان بی ناتکوژم تابەچاوی خۆت ماهی ئەفرۆزە ببینی چۆنی دەهێنم و دەیکەمە بووک بۆ برام گۆتی زۆر چەنەی ناوێ گورزەک بۆ خۆت هەلگرە و بابرۆینە مەیدان ئینجا بەدیار دەکەوێ کێ مەردە...

شێرزاد کە سەیری نیقاپۆشی کرد گورزی (١٠٠) باتمانە شێرزاد گورزەکی (١٥٠) باتمان هەلگرت و گۆتی فەرموو، جووتە پالەوان چونە مەیدان یەک دووسەر لە ناو مەیدان هاتن و جوون هەر شیعریان بەسەر یەکتریدا هەلدە گوت لە ناکاو لێک نزیک بوونەوە (دوو باز،دوو شێر،دوو مەردی دلێر، سنگیان لە سنگی یەکدی دابوو بە تۆ زووتەم تومان و هەورە تریشقە حەیوانات لەو دەورووبەرە بە کۆرە شیوان لەگەل مام رێوی هەلاتن هەندەک دەیانگوت حەشرە هەندەک دەیانگوت نەشرە هەندەک دەیانگوت نادونیا خرابوونە)، کە دونیا روناک بووەوە نیقاپۆش گۆتی گورزی خۆت بوەشێنە پالەوان شێرزاد گۆتی دەستی یەکەم بۆ کافرانە کافر تۆ گورزی خۆت بوەشێنە کافر دوو سەران لە مەیدانی هات و چوو شێرزاد مەتاری کردە سوپەرو لەسەر سەری رایگرت باسکی هەرودکو کۆلەکە لەبنداچە قاندن کە کافر گورزی گرانی سەد باتمانی لە

ئاسمان دوو سێ جار سوڕاند گورز لە دەستی لە ئاسمان وەک گوجیلە سەگ نورە نوڕی دەهات حەوالەی سەری شێرزادی کرد دنیا بوو بە تۆ زوتەم شێرزاد لەهەموو ئەعزای لەشی خوێن فیچقەی کرد شیری بە مندالێ خوارد بوو لە کونە لوتی هاتە دەرێ گۆتی پەککو جاری پێ چوبم ئەو جارەیە یەک دوو ڕکێبی لەولاخ داو لە ناو خـــاک بەزۆر هاتە دەرکـــە دونیـــا ڕوناک بوەوە دیتی وا نیقاپۆش لە پارچە گۆشتەکی دەگەڕێ بەسەری ڕمیەوە بکات بۆ یادگاری...
شێرزاد لە پشتەوە سەرە ڕمەکی گەیاندە قونێ گۆتی ها کافر لە چی دەگەڕێی گۆتی تۆمای... گۆتی کافر کە منالێ بووم لە ناو منالان یاریم دەکرد لە منالێ دایک یەتیمەکەدا دایکی چووەلای دایکم شکاتی لێ کردم کە چومەوە مالەوە داکم تیرۆکەکی لەسەری دام ئەوەندەی گورزی تۆم هێشا گۆتی قەت وانیە گۆتی بەرێ واللە گۆتی کەواتە گورزی خۆت بوەشێنە... نیقاپۆش مەتاری دانا سەر سەری شێرزاد یەک دووسەرهات و چوو گوورزی بردە بەری ئاسمان (الامان، الامان، شت لە بازاڕی ئاسنگەران) گورزی دابەزاندە سەری کافری گۆتی یاللە قەلغانی لە سەری سەری پارچە پارچە بوو ولاخی دانیشتە سەرعەرزی کە تۆ زرەویەوە کافر قاقاپێ کەنی گۆتی ئەوە قوەتی گورزەت بوویان بێرە خۆرەک بوو بەسەر سەری منتدا کرد بەو قوەتەش دەچی(ماهی ئەفرۆزە) لە مەغربستان بۆ برات دەینی ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە بەردەوام بوون نە ئەو زەفەری بەو بردونە ئەو مەفەری بەو برد، نیوەڕۆو ئێوارانیش کە دەچونەوە چێشت و تەعامیان لەلایەن دێوەکان بۆ ئامادە کرابوو (بۆ بەیانی کەڕۆژ لە بورجی مونەوەر هاتەدەرێ سەری چیایان زەرد بوو بنیان ڕەنگ و ڕەنگ بوو کولوک سەریان مۆر دەکرا گیاسەوزایی دەپۆشی، نەسیم بزوت گول و وەنە وشەی بزواندان چێشتی پالەوانان خورا) بۆ فراوینێ هەریەکەی کە لەشە حەیوانەکی خوارد بە جووتە سوارە دەست لە ناو دەست چونەوە مەیدان ئەو ڕۆژە گۆتی شێرزاد بە چ شەڕ بکەین شێرزاد گۆتی بەچی بلێی دەیکەین ئەو ڕۆژەیان بەشیران بردە سەر نە ئەو زەفەری بەو بردنە ئەو مەفەری بەو برد. ئێوارە دەست لە ناو دەست گەڕانەوە بۆ قەسرو قسورو باغ و باغات بۆ بەیانی ئامادەی مەیدان بوونەوە بەو جۆرە حەفت شەو حەفت ڕۆژیان بەسەر برد کەس زەفەری بە کەس نەبرد ڕۆژی هەفتەم کافر وتی وەرە بردیە ناو ئەشکەو تەکی پێلاوی زرێ پۆشی لە پێ کرد پێلاقەیەکی لە شاخیدا مەترەک پێی چوە ناو شاخی گۆتی

شێرزاد تۆش خۆت قایم بکە ئەویش پێلاقەیەکی لە شاخی بەرامبەری ئەویدا
ئەوەندەی وی شاخی قۆڵ کرد خۆی قایم کرد کەمەندیان هاویشتە یەک
هەریەکەی هەفتا کەمندی لەوی تر قایم کرد کەمەند پارچە پارچە بوون کەس لە
جێی خۆی نەجولا ئەو جارە کافر گوتی شێرزاد چەکمان نەما گورزەو شیروتیر
نەمان مەتار نەما بە چ لێک دەین شێرزاد گوتی کافر بە چ دەرێی ئامادەم...
بەرەبەرە ئەحمەدیش لە نەخۆشیەکەی حالی چاکتر ببوو هەموو جار کە
دەگەڕانەوە لە دێوانی دەپرسی کێ لە پێشەوەیە دەیانگوت نیقاپۆش دەیوت
بەداخەوە هێشتا هەر ئەو سەرکەوتوە ئەوجارە نیقاپۆش گۆتی:شێرزاد بەملان
دەکەین دەستیان بە زۆرا نبازی کرد هەتا نیوە ڕۆچەند جێیان گواستەوە دەبووە
قوڕلەبەر ئارەقی بن پێیان کەس زەفەری بەکەس نەبرد شێرزاد ڕای دەکێشا
نزیکەی هەشتا مەتر لەو مەیدانەکە دەگەڕاوە کافر شێرزادی هەشتا مەتر ڕادە
کێشاوە، نیوە ڕۆ شێرزاد گۆتی نیوە ڕۆیە، کافر گۆتی خواردن نییە تایەک
یەکی نە بەزێنین تائیوارە هەر بەیەکدی وە بوون ئیوارە کافر گۆتی ئیوارە یە
شێرزاد گۆتی خواردن و ئیسراحەت نییە شەویش هەر بەردەوام بوون بەرەبەری
بەیانی کافر زۆر زۆر هیلاک بوو شێرزاد هاواری کرد یا الله پێیەکی هینا پێش
یەکی بردە پاش بلندی کرد لە عەرزی کردەوەو خستیە سەر دەستی خۆی وەک
کێشکە سوڕاندی لەسەر دەستی و حەفت جار هیناى و بردی لە ناوەندی
مەیدانێ بەعەرزی دادا حەفت گەزعەرزی پێ قۆڵ کرد هەری کێشا چە قۆی هەر
ماس کە زگی هەڵبدڕی، بەڵام واعادەت بوو کە پاڵەوانەک ئەگەر نقابی پۆشی
بادە بوو نقابەکەی بدڕێن بزانن ژنەیان پیاوە بە هەر ماسەکەی نقابی هەڵدڕی
جوتە مەمکی سپی وەک کافور لە سەرسینەی بەدەرکەوتن شێرزاد بە خۆی
گوت تف لە خۆت و پاڵەوانە تیت ئەچی ماهی ئەفرۆزە لۆبرات دەینی ئەوەیەک
حەفتەیە ژنەک ڕێی لێ گرتی و شەڕی لەگەڵ دەکەی نیقاپۆش گۆتی هەناسە
هەڵمەکێشەوە پاڵەوان هەیە لە دونیا ملی من بگری دێوو خێو نەما نەیکوژم
تائیستا دوازدە کوڕە پاشام کوشتووە سوندیشم خوارد هەریەکێ لە عەردیم
بداشوی پێ دەکەم ئیستاش هەڵم ستینەوە ماردیم لە تۆهات باوەڕیشم بەخوای
تۆهێنا خوایە کەو بێشەریکە ئەگەر خوای تۆ ڕاست نە بانەتدە توانی من لە
عەردی بدەی خەفەتیش مەخۆ، دونیا ڕوناک دەبوەوە بەردومال بوونەوە
دێووتیان ئەحمەد مزگێنی بێ شێرزاد لە پێشەوەیە وتی الحمد لله دیارە لە

عاردی دایه... بەرەو ماڵ بوونەوە ئیسراحەتیان کرد نیقاپۆش گوتی شێرزاد وەرە من سڕی خۆت بۆ ئاشکرا بکەم من کچە پاشامە بە وکم منی بە مێرد داشەو بەزاوام گوت وەرە ئەتۆ ئەگەر پیاوی منی پێویستە لە عاردم بدەی پاشان زوو لە عاردم داو ووتم تۆ پیاونی بۆ مێردایەتی من دەست نادەی سەرم بڕی باوکم (١٢) جارمنی بەمێر ددا هەر دوازدەم کوشت پاشان وتم من بڕوا بکەم ئەچم لە چیایەک ئەغەزرم یەکەکم هەر لێ ڕاست دێ لە عاردم بداو شوی پێ بکەم ئەوانە کەس لایق بە من نینە ناویشم نیقاپۆش نیە ناوم (ماهی ئەفغانە) کەسیش نازانی ناوم ئەو ناوەیە من بە نقاپۆش مەشهورم نامەوێ کەسیش بەناوم بزانی غیری من و تۆو خوا من هەر نیقاپۆش ناومە خوشکە کیشم هەیە ناوی (ماهی تابانە) لەمن جوانترە ئەچین ئەویش لۆبرات دەینین وازلەکچی پاشای مەغریبستان بینە بە کەس نایێ هەزاران پاڵەوان سەری خۆی بە برین داوە لەوێ گوتی بەکە لک نایێ ڕەسمی پێیە هەردەبی بۆی بینم گوتی کەواتە منیش دێم چونم لەگەڵ تۆو هاتنەوەم لەگەڵ تۆچێشت و نانیان خواردو وڵاخیان زین کردن و سوار بوون ئەحمەدیش وەی لێ هات خۆی لەسەر پشتی وڵاخی ڕابگری وڵاخیان بۆویش ئامادە کردو ڕۆیشتن هەموو پێکەوە لە دامێنی چیایەک دیتیان پاڵەوانەک دانیشتیە چل پاڵەوان دەورەی دایەکە ئەو جەماعەتەیان دیت هاتنە سەر ڕێی وتیان نابێ کەس لێرە تێپەڕی تاجزیە نەداجزیەواتە چونە مەیدان (نیقاپۆش) وتی من دەچم (شیرزاد) وتی تامن مابم نابێ کەس بچیتە مەیدان کەمن مردم دوای من کەیفی خۆتانە (شێرزاد) چووە مەیدان هەمووی سەعاتێکی نەبرد بە عەرزی داداو گوتی من کوڕە پاشام کارم ڕێگربە لێرە ناوم (مربندەی هیندیە) مادام منت بەزاند پێویستە ماوەیەک لە ماڵەوە لەلای من ئیسراحەت بکەن چوونە ماڵەوە هەفتەیەک لەلای مانەوە خزمەتی کردن گوتی (شێرزاد) بۆ کوێ دەچن وتیان حارومەسەلە ئەوەیە گوتیان بەخوا بەلاشە هەموتان دەفەوتێن، بەڵام منیش لەگەڵتان دێم خواکەرێمە ڕۆیشتن هەموو پێکەوە لە چیایەک گەیشتنە یەکیدیکە (شێرزاد) ئەویشی بە زاندناوی (ڕای هندی) بوو ئەویشیان بەگەر کەوت لە ڕێگا گەیشتنە چوار باغەکی حەوزەکی لە ناوەندێ بوو هەمووی بە زێر داپۆ شرابوو چل کورسی لە دەورەی ئەو حەوزە بوو کور سیەکیش لە ناوەندی بوو (نیقاپۆش) گوتی (شێرزاد) دەزانی ئەوجێو مەکانە مولکی کێیە وتی نا واللە وتی ئەوە باغی کچی شای

پەریانە پاش ماندوو بوون دێت لە ناو ئەو چوار باغە ئیسراحەت دەکەن و لەو حەوزە مەلەوانی دەکەن و خۆیان دەشۆن نیقاپۆش گۆتی شێرزاد وەختی هاتنیانە ئێستا خۆمان دەشارینەوەو دەیان بینین- ئەحمەدو جماعەتیان بە دوورخستەوە، نیقاپۆش و شێرزاد خۆیان حەشاردا لە ناکاو لە شەقەی پاڵیاندا هاتن چل و یەک پەری دابەزین کچی پاشا لە ناوەندیان لەسەر کورسیەکە هات دانیشت کە نیقاپۆش چاوی پێ کەوت وتی خوایە لۆ خاتری هەر (١٤٤) هەزار پێغەمبەری ئەو کچە ببیتە هی شێرزادی پەریەکان ویستیان خۆیان رووت کەن و مەلەوانی بکەن کچی پاشا وتی راوەستن کاتی مەلەوانی نییە نازانن مێوانمان هەیە وتیان کێ؟ وتی (شیرزاد) کوڕی حاجی پاشا شێرزاد وەرەدەر شێرزاد ناچار بوو هاتە دەرێ گۆتی خێرە رێگات کەوتیتە ئەوجێ و مەکانە؟ شێرزاد وتی بۆ فلان ئیش هاتووم وتی شێرزاد ئەو کچە بە (شاهی ئەسکەندەر و محەمەدی شێرزادیش) نایی وازلەو فکرە بێنە شێرزاد وتی سەرەکم هینایە و نای گێرمەوە ئێستا ئەگەر هەندەک میوەمان دەدەیێ ئەگەرنا ئێمە دەرۆین سەفەرین گۆتی شێرزاد راوەستەکەم کەمە پەردەی لەسەر رووی لادا دەم و چاوو خاڵی گەردەنی دەرکەوتن وەک مانگی چواردە دەدرەو شایەوە نیقاپۆش لە جێی خۆی دەیگوت سبحان الله خودایە چیت دروست کردو وەکچەکە وتی شێرزاد من کچم ئێستا دەتوانم بە دەستەکی بڵندت کەم تۆ ئەو زەلامەی بچی ماهی ئەفرۆزد لە مەغرب زەمینی بینی شێرزاد مووی لەشی وەک نەشتەر راست بوونەوە کچی پاشا وتی شێرزاد خۆت بگرە. بۆ تاقی کردنەوەی بوو شێرزادی راکێشاوویستی بەرزی بکاتەوە شێرزاد وەک سنگ چەقی بە هەموو تاقەتی خۆی کچەکە شێرزادی پێ نەجولا ئینجا شێرزاد وتی خانم خۆت بگرە خانمی بڵند کردو ویستی بەعەرزی دابدا وتی نەکەی شێرزاد من سوعبەتم کرد ئینجا وتی مادام هەردەچی ئەوە کارتی من هەر لێرە هەتا یەک مانگی تر ئەوە مەملەکەتی منە لەهەر جێیەک نانت لێ برا خواردن یان شتەکت پێویست بوو کارتی منیان پیشان بدە تۆ حەقت نەبی، دوعا خوازیان لە خانم کردو رۆیشتن نیقاپۆش پاش ماوەیەک وتی شێرزاد وانزیکە لە مەملەکەتی پەریان دەردەچین مەملەکەتی وان شوورەی لە دەورەیە کە گەیشتینە نزیک شوورە کارەکەری ئاغاژن پێت دەڵێ شێرزاد ئاغاژن گۆتی چاوی ماچ دەکەم تۆ پێی بڵێ، شێرزاد گۆتی هەر دوو چاوی ماچ دەکەم وتی مانای

چییه؟... وتی ئەگەر تۆ بڵێی هەر دوو چاوی ماچ دەکەم ئەوە لێی دەبەیەوەو مارەیی لە تۆ دێت وتی کەواتە دەبێتە هەوێی تۆ وتی منیش ئەوە ئاواتمە ئەو نازدارە ببیتە هەوێی من. گەیشتنە بەر دەرگایەکە کارەکەرە کە لەوێ بوو بەخێرهاتنی لێ کردن وتی شێرزاد ئاغاژن سەلامی هەیە وتی والەمەملەکەتی من دەرچوون خواحافیزی بێت سەرکەوتوو دەبی انشا و الله چاوی ماچ دەکەم ئەو ئەگوستیلەیەش لەلات بی ئەگەر کەوتیە بەین حەفت بەحران بای مەدە ئەگەر کەوتیە بەینی حەفت کێوان بای مەدە ئەگەر نالە هەرجێیەک ئەنگوستیلەت بادا من دەتگەمێ، شێرزاد گوتی بە ئاغا ژن بڵێ هەر دوو چاوی ماچ دەکەم کارەکەر گەڕاوە خانم وتی چی وت!... گوتی بە ئاغاژن بڵێ زۆر مەمنونم هەر دوو چاوی ماچ دەکەم خانم وتی والله بردیەوە مارەییم لەو هات ئینجا شێرزاد رۆیی ڕۆیشتن تا گەیشتنە مەغریب زەمین لەوێ کەسەیریان کرد شار دیواری هەیە هەر لە بەینی مەترەک پاڵەوانەک دانیشیتە بە خۆی و شیروتیرو گورزی ئامادەیە بۆشەڕ... ناوی خوایان لێ هێناو لە دەرگا چوونە ژورەوە کەس لێی نەپرسین بۆ کوێ دەچن (ئەسغەرەی) دیو وتی پاشام خۆش بی ئەو قەسرەی لە هەموو قەسران برند ترە لەو شارە ئەوە قەسری کیژی پاشایە گەڕان تاگەیشتنە بەردەرگای قەسری کچە چەند دوکاندارەک لەوێ بوون بە دوکان دارەکانیان وت ئەو دوکانانە نافرۆشن وتیان ئەشیای تیایە وتی ئەشیاو بایی چەندە ئەوە چوار ئەوەندەی ئەشیاتان یەکسەر دوکانە کانیان چۆل کرد شێرزاد بە جەماعەتەوە لێی دانیشتن، کورسیەکیان لەبەر دەرگا دانا بو (ئەحمەد) بەیانی کە رۆژ لە بورجی منەوەر هاتە دەرسەری چیایان زەرد بووبنیان ڕەنگاو ڕەنگ بوو خانم لە ناو لێف و دۆشەکی ئاوربشم هاتە دەرکە سەیری پەنجەرەی کردکە بەسەر جادەیدا دەڕوانی چەند کەسەکی بێگانەی هاتە بەرچاو هەر مبالاتیشی پێ نەدان چەند ڕۆژەک بەو جۆرە مانەوە نیقاپۆش گوتی پاشا خۆ ئێمە نەهاتینە لە ناو ئەو کۆنە خانیە لەو شارە دانیشین برۆ ئەو قەسرێ هی قەسری پاشایە بزانن مەتالیبی چییە داخوازی کچەی لێ بکە... شێرزاد گوتی ڕاست دەکەی... شێرزاد سواری ڕەخشی خۆی بوو بەرەو قەسرێ پاشا سەرکەوت کەدیتی بەردەرگا هەمووی پاڵەوانە- پاڵەوانەکان چوون سەری ڕەخشی بۆ بگرن زانیان میوانە شێرزاد گوتی کەس سەری ئەسپی من نەگری... جلەوی فڕەدا سەرپشتی و بەقادرمەکاندا سەرکەوت کە گەیشتە

دەرگای دیوەخانێ پاشای سەری سوڕماقەت پاشاو دیوەخانی وای نە دیبوو...
دیوەخانەک بوو ئەوەندە درێژو گەورە کەس گوێی لە قسەی ئەویتر نەبوو لەبەر
گەورەیی کورسیەکی بەڕەوڕەوە لە ناوە ڕاست بوو پاشا لەسەری دانیشتبوو
دەمەک لەو سەری دیوەخان قسەی دەکرد دەمەک دەچووە لای دی قسەی دەکرد
وتی ماشا و الله خودایە لە گەورەیی تۆ شێرزاد لە دەرکە بە ئەدەبە وەسەلامی
کرد سەلامیان وەرگرتەوە پاشا بەخێرهاتنی کرد گۆتی نانی بۆ بێنن گۆتی نانم
خواردیە گۆتی کوڕم ئەگەر هەژاری هەتا چەند مارو زێرت پێویستە بتدەمێ
ئەگەر غەدرت لێ کرایە هەتا حەقت بستێنم ئەگەر مەملەکەتت داگیر کرایە
هەتا قوەتت بدەمێ برۆ تۆ لەی خۆت بکەوە گۆتی پاشام خۆش بێ من
پێویست بە هیچی تۆ نیمە کەسیش نیە لە دونیا بەری ملی من بگری من
مێوانی تۆم برام عەشقی کچی تۆ (ماهی ئەفرۆزە) بووە هاتوم بۆی ببەم ئەگەر
حەزت لە خزمایەتی منە ئەگەر نابە شەڕ لێت دەسێنم پاشا قاقاپێی پێکەنی
پالەوان خۆیان گیف کردەوە پاشا گۆتی دانیشن گۆتی کوڕم کیژی من بۆ برای
تۆ نەبی بۆ کێیە یاخوا بەخێر بێی سەر هەر دوو چاوانم، بەلام کوڕم دانیشە
بادوو قسان بکەین گۆتی فەرموو گەورەم گۆتی ڕۆلە تۆ چەند کەست لەگەلە
گۆتی چوار پینج کەس گۆتی ڕۆلە تا ئێستاسەد کوڕە پاشا هاتووە هەریەکەی
بەخۆی و سەد هەزار پالەوانی نەیان توانیوە یەک شەرتی بچووک بۆمن
جێبەجی بکەن تۆ سەدویەکی، بەلام باپێت بلێم ئەگەر توانیت ئەوە موبارەکت
بی ئەگەر نا گلەییم مەکە شێرزاد گۆتی پاشا شەرتە کەت بلێ، گۆتی کوڕم من
مەلەوانم هەبوون لە ناو دەریاکان ئیشیان دەکرد ڕۆژەک جوانە ماینەکی
بچوکیان لە ناو ئاوێ هینادەرێ هەرچەند بلێ جوان بوو وەزیر پێی گۆتم
حەوزەکی لۆ دروست کە ئەوە فێرە ناو ئاوە حەوزەکم لۆ دروست کرد ڕۆژی
جارەک دوو جار دەمان هینا دەرێ و دەمان بردەوە ناو ئاوێ بەرەبەرە ئەو
بێچووە گەورەبوو زیاتر لە ئاوێمان دەردیناتا وای لێ هات پێی عەرزی بگری
ئەسپ گەورە بوو چەند پالەوانم هەیە هەموو یان دەستیان لەسەرپشت
داناپشتی نەچەماند پاشان چوار باخەکمان بۆ دروست کردو بردمانە ناوێ
ڕۆژەک لە ڕۆژان پاشای کۆرە پێی زانی پاشایەکی زۆر بەدەسەلات و بەناو
بانگە ئەو ئەسپەێ دەست بەسەر داگرت و لێی زەفت کردین ئەمەش بە پاشای
کۆرە ناوێرین برۆ ئەسپی من بینەوە ئەوە کچی من مبارەکی برات بی ئەگەر نا

هەرچی لە توانا تدا هەیە بیکە شێرزاد گۆتی زۆر باشە پاشا، بەڵام سەنەدەکم بۆ بکە کەمن ئەو ئەسپەی تۆ دینمەوە ئەو کچەم بدەیێ گۆتی ئەوەش سەنەد، بەڵام جێگای براو جەماعەتت لە کوێیە؟ وتی والە بن قەسری کچی تۆیە گۆتی تۆش سەندەکی بکە کەبرات هیچ چاو بازی و بێ نامۆسی نەکات ئیشارەت و شتی بداتە کچی من وتی چاکە ئەگەر برام چی کرد بیکوژن گۆتی باشە سەنەدی کردو گەڕاوە لای جەماعەتی نیقاپۆش گۆتی ها شێرزاد چیت کرد وتی سەنەدمان کرد لە بەینی یەکدی من دەڕۆم وتی شێرزاد بڕۆ سەنەدەکی تری پێ بکە برێ ئەگەر جەماعەتی تۆ غەدریان لە براو جەماعەتی من کرد گلەیم لێ مەکە مەملەکەتت لێ ویران ئەکەم باری خۆت لە ملی خۆت شێرزاد گەڕاوە لای پاشا، پاشا گۆتی زۆر چاکە ئەوەش سەنەد شێرزاد گەڕاوە لای جەماعەت خواحافیزی لێ کردن بە تاقە سوارە لە شار چووە دەر لەسەرپشتی ڕەخشی شێرزاد ڕۆیشت ئەسپی پاشای بینیتەوە بێنەوە سەرمە سەلەی ئەحمەدی، ئەحمەد کورسیان لۆ دانا لە بەردەرگای بەرامبەر ئەو پەنجە رەیە دادەنیشت کچەکەش هەر دەهاتە لای پەنجەرە وسەری دەردەهێناو خۆی پیشانی دەدا ئەحمەدیش بەرامبەری هەر ئیشارەتی دەدانێ لە پێش چاوی ئەو خەڵکە ڕۆژەک لە ڕۆژان دیۆ گۆتیان ئێمە زۆر پیسین دەچین لەدەو ڕووباری سەری خۆدەشۆین ئەحمەدو نیقاپۆش گۆتیان برۆن باشە، نیقاپۆش زۆر دژون بوو ئەویش چووە ژوورێ دەرکەی لەسەر خۆی قایم کردو ئاوی لۆ خۆی گەرم کرد کەسەری خۆی بشوا دەرگەوانی قەسریش ئەوە بەرامبەر ئەحمەدو کچی پاشایە لێوی خۆی دەکرۆژتن لە رکان گۆتی ئەوە بابی منی گا خۆ من گەوادی ئەو کابرایە نیمەمن مردم لە خەفەتان تاوی داسەر ئەحەدی و لە پشتڕا شمشیرەکی لە پشتی سەری ئەحمەدی دا ئەگەر لە کێوی ئەلبوزریدا باشەقی دەکرد ئەحمەد ئاوڕی لێ داوە دیتی ئەوە حەرەسەکەیە گۆتی سەگباب ئەو شمشیرەت لۆ لەسەری مندا من چیم کردیە چ شتی غەلەتم کردیە! دەستی دریژ کردو حەرەسەکەی گرت و هینایە پێشە خۆی لاقەکی لەسەر لاقی دانا کردی بە دوو پارچە لە ناوەندێ سەری بڵند کرد خانم ئاگای لێیە گۆتی ئاغاژن حەرەسەکەت هەبوو لۆم کردی بە دوو ئەحمەد لە نەعرەتەی دا نقاپ ڕەش گۆیی لێ بوو گۆتی قەوما پرچی هەربەکەف بوو کە نقابی لەسەر خۆی هەلکێشاوەو هاتە دەرێ کەدیتی سەد پاڵەوان بە جارەک هجومیان کردە سەرسەری ئەحمەدی کردیانە

جەنگی مەغلوبە لەسەری، کە نیقاب ڕەش دیتی ئەوە ئەحمەد پشتی خۆی بە دیواریوەنایە هەر شمشێری دەوەشینی ئەویش خۆی هاویشتە سەرپشتی ڕەخشی خۆی و نەعرەتەی لێ داتا گەیشتە ئەحمەدی سەری پەنجا پاڵەوانی بڕی ئەحمەدی هەڵگرت و لە پشتە خۆی داناو هاواری کرد پاشا زۆر عەیبە بۆ تۆ ئەمەسەنەدن لە بەینە لە ناو ماری خۆت هێرشی بەسەد پاڵەوانی دەکەیە سەر دوو کەس و دەکەیە جەنگی مەغلوبە لە سەریان ئەوە مەیدان ئەگەر شەڕدەکەی با پاڵەوان لۆ پاڵەوانی بچینە مەیدانێ پاشا هاواری کرد لە شکر گەڕاوە لەوکاتەش مربندی هیندی و دیۆکان جەماعەتیان گەڕاوە زانیان نیقاپۆش ئەو کەتنەی کردیە بۆ بەیانی تەپڵێ شەر لە میدان لێ درابە ناوی پاڵەوانەک بەناوی نیقاپۆش وەلاّم دراوە کە چووە مەیدان دوو سەر هاتوچوو لە مەیدان ئەو پاڵەوانەی کوشت تا ئیواری ( ٥٠ ) پاڵەوانی نەقەنەقەی پاشای کوشت ئیوارە تەپڵێ ئاسایش لێدرا هەر کەس گەڕاوە شوێنی خۆی ئێوارە چوونەوە خانوی خۆیان نیقاپۆش چووە ژوورێ (نۆشدا روی) خستە سەر برینەکانی و برینەکانی ساریژ بوون حیکایەت دووری بەنزیکی دێخی ماوەی مانگەکی نیقاپۆش شەری ئەکرد لە مەیدان وشەوانیش پاسەوانی لە خۆی و ئەحمەد دەگرت نەوەک لە ناکاو هێرشیان بکە نەسەرو لە ناویان ببەن...
بێینەوە سەر مەسەلەی شێرزادی هەر ڕۆیشت هەر ڕۆیشت تاگەیشتە بەینی حەفت بە حران لە جەزیرەیەک لە ماندویەتی و برسیەتی کەوت بە خۆی و بەرەخشی لیێ پاڵداوە کەدیتی دێوەک هاتە خوارێ فیلەکی لە پێش دەڕۆیشت چوار سەبەتە ترێی لێ نایە هەر دەنکی ترێی ئەوەندەیە کە چاوی بە شێرزاد کەوت گۆتی ها سوننی بۆ مەسەلەی ڕەخشی نە هاتبی بەخوای سەد کەس هاتیە لێرە کراینە گاوان و شوان دیارە تۆش حەزت لە گاوانیە بۆیە ڕێت غەلەت کردیە، لە دلێ خۆی گۆتی هەی سەگباب چارەت دەکەم گۆتی دێوە باش گوێم لێت نەبوو گێی لای تۆم گرانە وەرە پێش بالە قسەکانت بگەم دێو هاتە پێش گرتی و سەری لە لەشی جوادا کردەوە کندرەکانی بڕین و ترێیەکەی داناو فیلی بەرەڵلاّ کرد کەوتە سەر ترێیەکە هەندەکی لێ خواردو لێی پاڵداوەو کەتە بیر کردنەوەو کچی پاشای پەریانی وەبیر هاتەوە ئەنگو ستیلەی با دایەکسەر کچی شای پەریان ئامادە بوو بەخۆو بە سێ کارە کەران گۆتی شێرزاد هەی خوا بتگری من نەم وت ئەگەر لە بەینی حەفت بەحران بی ئەنگوستیلە بامەدە ئەگەر

نامن و تۆش دەفەوتێین گۆتی ئەگەر من لێرە بە تەنیا بمرم باتۆش لەگەڵ من بمری گۆتی هەستە زوو بابڕۆین گۆتی دانیشە من هیلاکم ڕانت دانێ با سەربەسەر ڕانت بکەم من مردم سەری بە ڕانی کچی پاشای پەریان کرد خەوی لێ کەوت گۆتیە کارە کەرەکان هەستن من شێرزاد هەڵدە گرم ئێوەش ئەسپەکەی هەڵیان گرتن و بردیاننە ئاسمان فڕین فڕین تا گەیشتنە نزیکی شارو مەملەکەتی پاشای کۆرە لەوێ نیشتنەوە لە دەرەوەی شار لەسەر بەرزاییەک داینا بانگی کرد شێرزاد هەستە دەمەو بە یانە ئەگەر هەتا نیو سەعاتی تر ئاگر بڵند بوو ئەوە دیارە عفریت و جادوو ئێمەیان دیتیە ئەگەر نادیارە نەیان دیتینە هەر سەیری سەعاتیان دەکردو پاش نیو سەعات هیچ ئاگر بڵند نەبوو گۆتی شێرزاد هەستە بڕۆ ناو شاری ناوی خوای لێ بینە- شیرزاد دوعا خوازی لێ کردن و بەتاقە سوارە چووە ناو شار خەبەر یاندا پاشای کۆرە کوڕە پاڵەوانەکی دی هات گۆتی یاخوا بەخێربێ بۆ گاوانی... بۆ شوانی باشە... گەیشتە بەردەمی قەسری پاشاکە بەسەرکەت دیتی وادیۆی کۆرە دانیشتیە سەدان دیۆ دەورەی دایە گۆتی کوڕم پاڵەوان یاخوا بەخێربێی ئەوە بۆ ئەسپی هاتی هەی ئەژدادی پاشای مەغریبستانت واو والێ بکەم ئەو هەموو کوڕە پاشایەی هیلاک کردن چییە کچە قەحپەیەکی هەیەو دەیان داتێ گۆتی پاڵەوان دەستت بخەناو دەستم کە شێرزاد دەستی خستە ناو دەستی پاشا دەستی گوشی خینی لە هەر پێنج پەنجەی دەرپەڕی شێرزاد نەیگۆت ئۆف ئەو جارە بە دوو دەستی ڕایگوشی هەر هیچ نەبوو خستیە بەینی هەر دوو چۆکی ڕای گوشی شێرزاد گۆتی مامە خۆت ماندوو مەکە ئەتوش دەستی خۆت بدە دەستی من کە دەستی دێوی کۆرەی گوشی شێرزاد هاوار هاواری لێ هەستا گۆتی پاڵەوان دەستم بەردە وەختە چاوم بە کۆرەیی دەرپەڕی سەد پاڵەوان هاتیە هەرچی دەستم گوشیە هاواری کردیە و شاپەکم لێ دایەو دەرم کردیە تۆ سەدویەکی ئیستاش مادام تۆ هەندە پاڵەوانی چاوی من بە تۆ نەبی بەکەس چاک نابیتەوە، ئەو لێرە بامێنی بێینەوە سەر باسی ئەحمەدو نیقاپۆش. ئەو غەریبە بۆ ماوەی مانگ و نیوەک دەبی هەموو ڕۆژەک بە ڕۆژ لە مەیدانە و بەشەو حەرەسی خۆی و ئەحمەدیە لەبەر ئازاری برینەکانی خەوی نیە ڕۆژەک ئەحمەد گۆتی نیقاپۆش من واچاک بویمەوە نۆبەتی منە بەیانی دەچمە مەیدانێ نیقابێوش وتی من سوندم لۆ برای تۆ خواردیە هەتا من مابم کەس ناچیتە مەیدانێ کە منیش

ئەمام کەیفی خۆتانە ئێواری لەمەیدان گەڕانەوە شەو تەپڵ بە ناوی پاڵەوانەکی لێدرا لە هەموو لایەکی شاری بوو بەهەلهەلەو چەپلە لێدان دێوەکان هەرسێک میزیان بەخۆ داکرد لە ترسان دەیان زانی چ پاڵەوانە نیقاپۆش گۆتی ئەسغەرە مەسەلە چییە!... گۆتی ئاغام ئەو پاڵەوانە گورزی لە چیایان بدا ئەکاتە دەریا گورزی لە دەریایان بدا... وشک دەکا ئەوەندە پاڵەوانە نیقاپۆش گۆتی ئەو لەوانی تر گورج ترنیە شەرت بێ بەیانی لە مەیدان بە پشتیوانی خوادەر دەکی پێ بکەم هەرجیل لۆ جیلی تر باس بکا، بۆ بەیانی کە خۆر لە بورجی منەوەر هاتە دەرچێشتی پاڵەوانان خورا سەری چیایان زەرد بوو بنیان ڕەنگا و ڕەنگ بوو ئەو پاڵەوانە هاتە مەیدانێ کە خەڵک تەماشای کرد عارەبانەی لۆ دروست کرا بوو فیل و مانگەنۆس ڕایان دەکێشا (٣٠) جووت فیلی لەبن بوو هەتا ئەو پاڵەوانە بەتەپل و مۆسیقا هاتە مەیدانێ. نیقاپۆش بەیانی خۆی ئامادەکرد چێشتی خواردو ناوی خوای لێ هینا زۆر مناجاتی کرد لەبەر خودای پاڕاوە هەر دەیگوت خودایە ئاگادارم بی بمپارێزی شەرمەزاری شێرزادم نەکەی یاللەی گوت و سواری ڕەخشی خۆی بوو ڕووی کردە مەیدانێ کە تەماشای کرد کافر وا لەمەیدانە و بەتەدارەکەوە ڕاوەستاوە کە پاڵەوان سەیری کرد قاقا پێکەنی: تۆ هاتی مەیدان داری لەمن بخوازی وەرە دابەزە سوجدەی بۆبت و سەنەم ببەو ئاوزنگم ماچ کە هەتا بتکەمە سوپا سالاری ئەو لە شکرەی و ببیە برای گیانی بە گیانی من هەرچی دەتەوێ لە دونیاش من بۆت دەکەم وازلەو کەللەڕەقیە بێنە حەیفە بەدەستم بکوژرێی تۆ پاڵەوانی، نیقاپۆش گۆتی کافریت و سەنەمی چی وەرە تۆ دابەزە و سەر هەڵبڕە ئەو خودایە ببینە کەمن و تۆی دروست کردودو ئەو هێزو توانایەی پێ بەخشیوی بت و سەنەم لەبەردودار دروست کراون چۆن سوجدەی بۆ دەبەی کە کافر سەری هەڵبڕی دیتی هەموو کچی شار لەگەڵ کچە وەزیرو کچی پاشا هەمووی لە دیاریان ڕاوەستاون لەو مەیدانە هەمووی هەتا ناو قەدی خۆیان ڕووت کرد بودوە لۆ کافری هەتا غیرەتی ببزوی و زیاتر بەهێز ببی دەستیان خستە ناو دەستی یەک لەگەڵ نیقاپۆشی کافر کە دەستی گۆشی لەبن هەر پێنج قامکی خێن بە جۆگەلە دەرپەڕی هەروەها نیقاپۆشیش بەو جۆرەوای لەوی کرد. دیسان کافر سەری بلند کرد کچە کانی شار هاواریان دەکرد دەی ئەو نیقاپۆشە بکوژە من بۆ تۆ ئەوەی دی دەیگوت من بۆ تۆ کافر قاقاپێیان پێ دەکەنی، دێوەکانی لەگەڵ ئەحمەدیش خۆیان ئامادە

کرد بوو گۆتیان هەر کاتەکی نیقاپۆش وەبن کەت هەرسێک هێرشی دەکەینە سەریان دەبی ئێمەش بکوژی یا نابی نیقاپۆش بکوژی لەمەیدانێ دوو پالەوان بەرامبەر بوون هەرچەند کافر بە نیقاپۆشی گۆت پالەوان گورزی خۆت بوەشێنە چونکە من گورزت لێ دەم کەس ئێسکانت نابینیتەوە نیقاپۆش گۆتی کافر دەستی یەکەم لۆ کافران هاتیە ترە ترێ مەکە قەت من ئەو قانونەی ناشکێنم. کافر دەخورامەکانی وەراخوری بەهەفت پالەوانان حەلقەی گورزیان گەیاندە دەستی، کافر گورزی بلند کرد دەوی خۆی لێک کردەوە یەک کەلەشە بەرازیان هاویشتە ناو دەوی بەتەواوی، کە کافر گورزی هەزار باتمانی بەرزکردەوەو دوو جار لە ئاسمانێ سوراندی گورزوەک کوورەی حەدادان ئاگری لێ دەباری وەک گوجیلە سەگ لە ئاسمانێ نورە نوری بوو، نیقاپۆشیش دیسان مناجاتی لە بەرخوای خۆی کردو هەر دوو دەستی کردنە سنگ لەبن مەتاری راگرت لە سەرسەری کە کافر گورزی دابەزاندە سەری نیقاپۆشی دونیا بوو بە تۆزو غوبار دەتگوت بەرقەک بوو لە کێوەکی داو ئاسەواری نەهێشت دێوەکان هاتن بزانن نیقاپۆش مایەیان نا کە تۆز رەویەوە دیتیان نیقاپۆش واسەری لەسەر لاملی کەتیە هەروەختە گیانی دەربچی دێوەکان لێی نزیک بوونەوە گۆتیان ها نیقاپۆش ئەوە ئەتوی واسەرت لەسەر لاملی کەتیەو هەناسەت نایێ ئەگەر وات دەزانی لۆ دەهاتیە مەیدانێ لۆ لێ نەگەڕای شازادە ئەحمەد بێتە مەیدانێ ئەی پاشان چ جوابی شێرزادی ئەدەیەوە هەر ئەتۆ نەبووی مانگەکی لەگەڵ شێرزادی شەرت کرد ئیستاوا خەریکی لەبەر ئەو کافرەی گیان دەدەی کە نیقاپۆش سەری بەرز کردەوە دیتی وا کافر لە مەیدانی جەولان دەکا لە دەورەی ئەگەر سێ جار هاتو چوو لە مەیدانی سەری بەرز نەکردەوە ئەوە سەری دەبڕی هانیان داسەری بەرز کردەوە لەرەخشی وە راخوری رەخشی لە ناو تۆزو خۆری تەکانیدا لە خاکی هاتەدەرێ دوو سەر لەو مەیدانە هاتوو چوو دەرمانی نوشداروی لەبن کونە کەپوی خۆی ناو هۆشی هاتەوە بەرەخۆی ئینجا گۆتی مەلعون (جیهان جام و فەلەک ساقی و ئەجەل نەی، خەلاس ئیبادەی مەرگت بە دەستم هات، جامی شەرابی مەرگت لەدەستم وەرگرە) دوو سەرهات و چوو دەستیدا حەلقەی گورزی گۆتی: (الامان الامان راوەستە لە دەستم ئەی گورزی گران) ئەگەر زیندە ماربی لەسەر رووی ئەرزی قەت خەلاس نابی لەدەستم بە هیچ تەرزی مەلعون پالەوانی شیرزادی قەت بە تو ناگێرێ ئەمن پالەوانی شێرزادیمە کو بە تۆ دێمە

گرتنیّ) که گورزی برندکرده ئاسمانیّ دەرِدخشی وەڕاخوڕی ڕەخش هاتوچوو هەر دوو پەلی پیشەوەی خستە سەر تەختەو ڕەورِەوان هەتا زیاتر گورزی بە قودت بوەشینی نیقاپۆشیش ئەوەندە بە هێز گورزی داوەشاند چەند کچە پاشاو وەزیر هەبوون لەبەرامبەریان هەموو لە تەختی وەرگەڕان هەر وەکو بۆمەلەرزە لیّ بدا ئەو مەملەکەتە هەموی لەرزی (گیاندار هەموو هەلاتن لۆ کێوان، مام ڕێوی بە کۆرە شیوان دا هەردەهاتن کلکیان لە ناو گەلیان نابوەوە، هەندەک دەیان گوت حەشرە هەندەک دەیان گوت نەشرە، هەندەک دەیانگوت نا دونیا خرابوونە) گورزەکی ئەوەندە بەتێنی لێداکە تۆز ڕەویەوە دیتیان کافر وائەسکوردی وەک گۆپار خوار بووە خەریکە ئاوزنگان دەکات (ئەکوانی) دێو غاری داسەری، یەکسەر تەورزینەکی لە سەری داو سەری بڕی... پاشاکە ئەو حالەتەی دیت سەری سوڕما گۆتی ئەوە دوو مانگ ئەو نیقاپۆشە لە شەڕ دایە چۆن توانی تا کەسپا سالاری من بکوژی ئەوە ئەوها بی ئەدی ئەوەی دێتەوە دەبی کو بی (ئەحمەدیش) وابەرامبەری (ماهی ئەفرۆزە) دانیشتووە، پالەوانەکی تری وەک وی هاتە مەیدانیّ گۆتی شەرت بی نابی گورزی مەلعونی ئەو جارەی بەسەری من بکەوی (نیقاپۆش) گۆتی مەلعون نۆبەتە، مەلعون گورزی بلند کرد بۆ ئاسمان کە لەسەری بدا (نیقاپۆش) لەرەخشی وە ڕاخوڕی گۆتی (یاپاکانی پاک، پاکی منەوەر، بەخالقی شەوو ڕۆژ، بەجقەی سەری ئەسکەندەر) ڕەخشی هەردوو قاچی هاویشتە سەر تەختە وڕەورەوان دەستی کافری گرت ودەستی بە گورزەوە لەبنی دەرهێنا ئەویشی کوشت تا ئیوارە سێیەمیشی کوشت کە ئەو سیّ پالەوانە تاکە ئومێدی پاشا بوون ئێواریّ گەڕانەوە (ئەحمەد) بە نیقاپۆشی گوت لۆنە تگۆت پالەوانیّ ئەحمەد یمە؟ گۆتی بیّ عەقلّ ئەمن پالەوانیّ شێرزادی مە ئەتو چی؟ ئیواریّ ویستی خۆی تەداوی بکات جماعەت پێیان گوت کاکە خۆت رووتکە با ئێمە دەرمانت بکەین، گۆتی لەبەرە بابی ئێمە عادەتە کمان هەیە نابی کەس لەشی ئێمە ببینی ئەوان نازانن کە نیقاپۆش ژنە تەنها (شێرزاد) دەزانی. چووە ژۆریّ نوشداروی بەبرینە کانی وەرکردو هاتە دەریّ لەبەر ئیش و ئازاری زۆر هیلاک بوو هەتا بەیانیش حەرەس بوو لە ئەحمەدی... بەیانی پاشا وەزیرەکی هەبوو زۆر عاقل بوو وەزیر گۆتی پاشا ئەوە دوو مانگە تاقە سوارەک لەمەیدانە پالەوانی ئێمەی نەهێشت ئەگەر ئەوی دی بێتەوە چ دەکەی... ئەو پالەوانە هەردێتەوە بزانیین با بێتەوە چی کردیە

پاشا گۆتی قەت نابی شەڕ ڕابگرم ئەگەر هەموو لە شکریشم بفەوتێ... بەیانی
کە (ڕۆژ لەبورجی منەوەر هاتە دەرێ) شازادە ئەحمەد سواری ڕەخشی خۆی بوو
ئەسبابی شەڕی هەڵگرت بە نیقاپۆشی گوت بەوخوایەی ئێمەی دروست کردوە
ئەمن دەچمە مەیدانێ ئەگەر بڕتیی لێ ناگەڕێم یان لێرە دەمکوژێ یان دەتکوژم
با نۆبەتی من بی خۆمنیش ژن نیمە... نیقاپۆش بەهەر حاڵ ڕازی بوو گۆتی
بامنیش ئەوڕۆ ئیسراحەت بکەم بزانم شازادە ئەحمەد چ دەکات! ئەحمەد چووە
مەیدانێ کە پاڵەوانەکە دیتی یەکی ترە گۆتی پاڵەوان ئەمن بەخوێنی
نیقاپۆشی تێنومە تۆ بۆ هاتی گۆتی مەلعون کاتی منت کوشت ئەو جا نقاپۆش
بکوژە کەدەستی خۆیان لەدەستی یەکدی دا شەقەی دەستیان گەیشتە ئاسمانێ،
ئەحمەد گۆتی پاڵەوان ئەمن مێشکم تەواو نیە تاقەتی قسەکردنم نیە زۆر
مەرێ گورزەکت هەیە بوەشێنە ئەگەر ناسەرت دەبڕم کافر گورزی بڵند کرد
ئەحمەد هێرشی کردە سەر کافری بلندی کرد بەتەختەو ڕەوڕەوەوە فڕێیدا بۆلای
جماعەتی خۆی دیو گەیشتنە سەری سەریان بڕی هاواری کرد پاشا منداڵان
مەنێرە مەیدانێ عەیبە پاڵەوانان بنێرە، هەتا ئێوارێ دە پاڵەوانی لەمەیدان
سەربڕی ئێوارە تەپلی ئاسایش لێدرا هەر کەس گەڕاوە جێ و مەکانی خۆی
کورسی خۆی بەرامبەر خانمێ دانا وەکو جاران نیقاپۆش دیتی ئەحمەد بەرامبەر
یاری دانیشتووە گۆتی لێ گەڕێ من مردم لەمەیدانێ با ماوەیەکیش ئەو سەر
گەورەیە بچێتە مەیدانێ هەتا من کەمەک چاک دەبمەوە... سێ ڕۆژ ئەحمەد بە
ودەستورە لە مەیدانێ بوو، ڕۆژی سێیەمین زۆر هیلاک بوو لەدەست
پاڵەوانەکی هەتا ئیوارێ بە زۆر لەدەستی دەرباز بوو... بۆ بەیانی نیقاپۆش
خۆی حازر کردو چووە مەیدانێ، پاڵەوان تەماشای کرد ئەوی دوێنی نییە
نەهاتیتەوە گۆتی ئەوەچییە ئەمن نێچیری دوێنێم دەوێ، نیقاپۆش گۆتی کافر
نێچیرو مێچیر نییە ئەو برا گەورەیە ئەو بە زۆر هاتتە مەیدانێ من برا
گچکەمە، پاڵەوانەکە گۆتی با ئەتو بکوژم ئینجا چارەی ئەویش دەکەم
کاتژمێرەکی نەبرد نیقاپۆش سەری بڕی تائێوارە لە مەیدان چەندی تریشی سەر
بڕین... پاشا مەملەکەتی خۆی بوو چەند شاری تری هەبوون بە جماعەتی گۆت
بڕۆن پاڵەوانان لەو شارانەکۆ بکەنەوە، لەو شارانە چەند پاڵەوانی نەقەنەیان
هینان... بەیانی پاشا گۆتی لەو جماعەتە کێ دەچنە مەیدانێ ئەو پاڵەوانە نە
بکوژی... گۆتیان پاشا لۆ ئەتۆ ئەمەت لۆ هەندێ هینایە قونی منداڵان

بسرپنەوە ئێمە پاڵەوانین ئەمە لۆ هەندێ دانراینە کێوان بکەینە دەریاو دەریایان بکەینە سەحراو وشکیان بکەین ئەمەددعیەمان نایێ لۆ ئەو پاڵەوانانە بچینە مەیدانێ... ئەوان لێرەبن بچینە سەر مەسەلەی (شێرزاد)... دێوی کۆڕە گۆتی بۆت بگێڕمەوە... من کەرە خشەکەم هینا زۆر غرور بووم رۆژەکی حەفت دێوم لەگەل خۆبردن چومە ڕاوێ سێ چوار رۆژ رۆیشتین گەڕاین لە ناکاو گەیشتنیە چیایەکی زەرد... چیایەکە زەرد بوو، گەیشتینە کانی و ئاوەکە کە سەیرم کرد حەفت کیژ وا لەسەر ئەو کانی و ئاوە شایی دەکەن یەکیان لە ناوەندێ بوو، نەکەی نەخۆی هەر تەماشای بکەی میوژی رەشی بخواردبا لەگەردنی دیار بوو پرچی سیسی سەری لەبەری پێیان بوو، ئیمەش لێیان نزیک بوینەوە، بانگی کردین مامە مێنە پێشەوە ئێمە ئافرەتین لۆ خۆمان لێرە شایی دەکەین برۆنە رێی خۆتان گوێمان نە دانێ هەر چوینە پێش گۆتی مامە بۆ خاتری خوا ئەمە لە سالێ یەک رۆژمان هەیە ئیزن دەدرێین شاییەکەمان لێ تێک مەدەن من تەحەمولم نەما هەر لێی چومە پێش، هەر دوو کەزی خۆی بلند کرد گۆتی مامە بۆ خاتری ئەو دوو کەزیانە چی دی مێنە پێش هەر گوێم نەدایێ کەلێی نزیک کەوتمەوەو دەستم بۆ برد تفەکی بە هەردوو چاوی داکردم دونیام لە پێش چاوی تاریک بوو هیچ دونیام نەدیت بە دێوانم گوت چیان لێ هات گۆتیان پاشا واللە نازانین لە پێش چاوی ئێمەش بزربوون، گەڕاینەوە بە کۆرەیی ئەوە هەفت سارەچاوم کوێرە ئەگەر چاوم چاک دەکەیەوە رەخش بۆ تۆ ئەگەر نا هەر چی نەتکردیە بیکە! سبەینی شێرزاد چێشتی خواردو پێی لە ئاوزنگی وڵاخێ خۆی ناو بەرەو چیای زەرد کەوتە رێ ماوەیەک رۆیی کە گەیشتە چیای زەرد دیتی بنەدارەکی گەورەی زەرد دیارەچوە لای بنەدارەکە دیتی کانیاوەکی زۆر خۆشە ئاوودارو باری هەموو زەردە، شێرزاد دابەزی دەست و چاوی شوشت ئاوی خواردەوە لە سەر تەنیشت لێی کەوت سەیری ئاسمانی دەکرد لە ناکاو دیتی تەیرەکی گەورەوا تەیرەکی کچکەی ڕاو ناوە ئیستا نا ئێستا دەیگری، تەیرە بچوکە کەیەکسەر بەرەو ڕووی شێرزاد هاتە خوارێ خۆی لەلای وی لە عەزریدا تەیرە گەورەش لە دوای بووکە (شێرزاد) تەماشای کرد تەیری کچکە بوو بەمارەکی بچوک کەسەیری کرد تەیری گەورە بوو بە عەزیایەک چەند بلێی گەورە گۆتی پەککو ئەوە هەموو جێیەک سحرە شێرزاد شیری هەڵکێشا لەگەڵ عەزیای گەورە کەوتە شەڕو پارچە پارچەی کرد غاری دا سەر ماری کچکە

گـۆتی مـەمکوژە کـەلـکم لۆ تۆ هەیە شێـرزاد گـۆتی سـەیرە ئەوە تەیر بوو، بوو بەمـارو وەقسـەش هات، گۆتی مـاری سەگـباب دەبی کەلکی تۆ چ بی بۆمن، مـاری گچکەیە کسـەر کلکی خۆی گەیاندەوە ناو دەمی یەکسـەر بوو بە کچەک لە هەمو کچە کانی تر جوانتر شێرزاد گۆتی ماشاء الله خودایە لەگەورەیی تۆ کچەکە گۆتی شێرزاد ئەمن کچی پاشای (جن)م ئەوە کوڕی پاشای کافران بوو هەموو ساڵێ لەگەڵ ئێمە بەشەردێن ئەو ساڵ لە شکری ئێمەشکا دوو براشم بە ئەسیرگـیران ناویشم (ماسرەیە) من فـیرارم کرد ئەویش کەوتە دوام، هیچ چارەم نەبوو کـە تۆم دیت لە ئاسـمــان بۆ لای تۆ هانام هێنا گـوتم بێگومـان ئەوە پاڵەوانەدە خـاڵەتی دەکـەم ئەگـەر پیـاوبی دەربازم دەکـا لە دەسـتی ئەو کـافـرە ئەگـەرنا با هەردووکـمـان بکوژی، ئەگـەر تۆنەت کـوشـتـبا ئەوە حـەیای منیـشی دەبرد، ئێستاش من داک و بابم و برام دێن بەدوام لێت دەپرسن پاڵەوان بخوازە مـاری دنیـایێ هەرچی دەتەوێ، ئەتوش بلێ پاشا تاس وزرێ یەکت هەیە پێش کەشم کە لەگـەڵ (مـاسـرە) یەکسـەر داک و بابی پەیدابوون کلچوکە کیـان لە چاوی شێرزادی نایەکسەر ئەوانی هەموو دیت، گۆتیـان پاڵەوان زادە تۆ حەیای ئێمـەت پاراست لە دەست ئەو کافـرە ئیـسـتـاش بخوازە ماری دنیـایێ شێرزاد گـۆتی پاشـا خـۆشی تۆم دەوێت، جـاری دووەم گـۆتیـان پاڵەوان بـخـوازە گـۆتی خۆشی ئێوە، جاری سێیەم گۆتیان پاڵەوان زادە دواجار بخوازە گۆتی پاشا تاس و زرێیـەکت هەیە لەگەڵ (مـاسـرە) پێش کـەشم بکە، پاشـا گـۆتی مـاسـرە هەر پێش کـەشی تۆ بی تاس و زرێ یەکـەش هەر بۆ تۆ باشـە شێـرزاد تاسـی لەسەر ناو زرێی کـردە بەر هەزاران شیـرو تیـرت لێ دابا هیچ کـاری لێ ناکـرد شێـرزاد دەستی داک و بابی (ماسرەی) ماچ کـردو دوعا خـوازی لێ کردن، ماسرە گۆتی ئەزانم تۆ بۆچی هـاتی بڕۆ بابچین چاوی پاشــای کــوێرە چاک کــەینەوە تارەخشـەکەی لێ بستینی کە نزیکی شاربوون خەبەریاندا پاشای کوێرە گۆتیان ئەوە کیژەکەی لە پشت خۆی سوار کردیە، گۆتی زووبن بیهـێنن قـوربانتـان بم باچاوەکـانم چاک کاتەوە کە گەیشـتنە بەر دەرگای پاشا، شێرزاد گۆتی ئەو ژنە ببەنە ناو ژنان بە خۆی چووە دیوەخان، پاشای کوێرە گۆتی شێـرزاد بە قـوربانت بم زوو بیـهێنە باچاوم چاک کـاتـەوە شێرزاد گۆتی ئەو ژنەو مەجلیسی تۆ پڕی پیاوە با دیوەخان چۆڵ بکرێ ئینجا بانگی دەکەین.

یەکسـەر پاشا دیوەخانی پێ چۆڵ کردن، شێـرزاد بانگی (مـاسرەی) کرد کە

هات گـۆتی مـام دێو چەند لەبەرت پارامـەوە چەند دەخـالەتم کـردی هەر ڕازی
نەبووی ئیسـتاش لەسەر دەستی من و شێرزادی ئیمان بەخواو پێغەبمەری بێنەو
ببە بەئیسـلام ئەوە چاکت دەکەمـەوە ئەگـەر نا دەبی هەر کـۆرە بی، دێو گـۆتی
ئیمانم بەخـواو پێغەمبەری تۆ هێناوە پێش ئەوەی ئەتو وەبلێی خوا یەکە و بێ
شەریکە چ شەریکی نینە، ماسرە دەرمانەکی لە باخەلی دەرهێناو لە چاوی کرد
یەکسەر چاوی چاک بووەوە لە خۆشیان شێرزادی گرتە باوەش یەک سەعات بۆن
و مـاچی کـرد گۆتی شێرزاد وەرە دێوان لەگەڵ خـۆت ببە مـەملەکەتی مـەغـرب
زەمینی و ئیران و سەرەو ژێربکەن بەیەکجاری کچکەکەش لۆبرات ببە شێرزاد
گـۆتی پاشـا من بەس خـۆشی تۆم دەوێ قـوەت و سـوپام پێـوبست نیـە بەتەنها
رەخشـەکەم بدەوە گۆتی شێرزاد رەخش قـابیلی تۆیە مبـارەکت بی، بەلاّم کەس
ناتوانی نزیـکی بی پشـتی ناداتە کەس والە ناو چوار باغی بەرەللایە، شێرزاد
چوو کەدیتی رەخش وا لەناو باغی جەولان دەکا هەندە جوانە هەر دەلێ خوابە
تابیەتی لۆ شێرزادی دروست کردیە کەرەخش چاوی بە شێرزادی کەوت هەڵستا
سەر پاشیـان و هێرشی بۆ شیرزادی هێناکە شێرزاد نقابی لەسەری خۆی لادا
نێو چاوانی خۆی پیشـانی رەخشی دارەخش لە پێش شیرزادی نگرۆیەکی کردو
لەسەر لە پان رۆیی و کەوتەبن دەست و پێی شێرزادی، شێرزاد بلّندی کردەوەو
زینەکی مرواریان لێ کرد و شێرزاد سواری سەرپشتی بوو ماسرەی خستە دوای
خـۆی و هاتەوە ناو شـارکـە پاشـای کـۆرە چاوی بە شـێـرزادی کـەوت والە
سەرپشتی رەخشە سەد ئەوەندە کەیفی هات و بەپیریانەوە هات گۆتی نابی ئەو
شەو بڕۆن دەبی ئەو شەوەش لای من بمیەوە شێرزاد گۆتی هەر دەرۆم دلّم لای
براو جەماعەتە دعا خوازیان لە پاشای دێوان کردو رۆیشتن شەو داهات ماسرە
گۆتی شێرزاد ئەترە[illegible] پشەیەک بخەوە من دادەنیشم بەیانی دەڕۆین بابێینەوە
سەرباسی نیقاپیۆش و جماعەتی... ژنی پاشای مەغرب زەمین داکی (ماهی
ئەفرۆزە) بە پاشای گوت پاشا تۆ بۆ ئەو هەموو خەڵکەت بەکوشتن دا ئەوە سێ
مـانگە لەو مەیدانەی شەرە... ئێمە پیرەژنەکی عەیارو سحر بازمان هەیە ئەو
شەو بانیـقـابپـۆش و جەمـاعـەتەکەی هەمـوو بە سـحـرو جـادو بدزی و تۆش
دەزیندانیـان بکە تا کابرا دێتـەوە... شەو پیرەژنە سـحر بازەکەیان بـانگ کرد
هەمـووی بە سـحـر دزین ناتوانـی سـحـر و جـادو لە ژنان بـکا نیـقـاپۆشـیش ژنە
فـویەکی لێ کـرد کـەوتە گـۆڕی کـەدەسـتـی پێداهینا زانی ژنە بەجێی هێـشت

گـەڕاوە لای پاشـا گـۆتـی پاشـام خـۆش بی هەمـوم دزین تەنهـا ژنەک نەبی لەگەڵیانەکە بەیانی داهات نیقاپۆش بە هۆش هاتەوە تەماشای کرد جەماعەتی هەموو دزرایە هێشتا بەیانی نەدابوو هێرشی کردە ناو مـەیدان و هاواری کرد پاشا حەیات هەبی... ناموست هەبی... شورەییت بەخۆت بێ غیرەنت نیە بە مـەیدان داری بەزی بە دزین و جـادو کـار لە مـەدەکـەی شـەرت بی ئەگـەر جماعەتی من (مربندو ئەکوان و ئەسغەرەو ئەحمەد) هیچیان لێ بێ (بەخودای تاک و تەنیـا بە یەزدانی پاک پاکی منەوەر بە پاکی پاکان بە جوقـقەی سەری ئەسکەندەر) هەربەو بەیـانیـە شـارت لێ و ێران دەکـەم ئەو ڕۆژە لەرقـان لە مەیدانێ (٨٠) پاڵەوانی سەربڕی شەوێ دەرمانەکی لە چاوی خۆی کرد لەبەر ئێش و ئازاری چاوی خەوی نەبوو نەوەک ئەو سحر بازەبیدزی یەک مانگ ئەوە کـاری بوو لە مـەیدانێ نەشەو نوستنی هەبوونە ڕۆژ ئیسـراحـەتی هەبوو خـوار دنیـشی لۆ خـۆی حـازر دەکـرد، ڕۆژەک لە مـەیدانێ زۆر هیـلاک بوو لەدەست پاڵەوانەکی کەوتە رەزالەت هەر ئەو دەمە بکوژرێ یا دەمەکی دی... کەشێرزاد خەوی لێ کـەوت لەسـەر چۆکی مـاسرەی خـەونـی دیت دیتی نیـقـاپـۆش هەتا ناوقەدی لە نـاو خوێنە هاواری کردو لەخەو ڕاپەری ماسرە گۆتـی چ بوو گۆتی قـەومـا جـەمـاعـەتم فـەوتـاینە گـۆتـی چۆن گـۆتـی خـەونم دیت نیـقـاپـۆش هەتا ناوقەدی لە خۆێن دایە هەر ئەو دەمەی بمری ئەو دەمەی دی... شێرزاد سواری رەخـشی باڵدار بوو رەخـشی خۆشی دایە مـاسـرەی وەک بـاڵدار فـڕی لە ڕێگا گەیشـتە کاروانەکی لێی پرسی لەوڵاتی مەغرب زەمێنێ چ هەیە، گۆتیـان کوڕە چ هەبی گەنجەک ڕۆژەکی هاتیە داوای کچی لە پاشای کردیە پاشاش بە دوای رەخشەکی دانـاردیە لای پاشای کۆرە، نیـقـاپۆشەکی لەوێ بەجێ هێشـتیـە ئەوە چوار مـانـگ قـوربەسەرە بەتاقە سوارە لەشەڕە جەمـاعـەتی دی هەمـوو کوژران ئەویش دونێ ئیوارێ کەئێمە هاتین زۆر هیلاک بوو لە مەیدانێ هەر ئەو دەمەی بکوژرێ یادەمەکی دی ئێستـا ئەویش کوژرایە... شێرزاد کە گـوێ بیستـی ئەو دەنگ و باسەی بوو ڕۆژی روناکی لێ بووەشەو فڕی بەرەخشی نوێ (ماسرەش) بەرەخشی کۆن نایگاتێ یەکسـەر خۆی کردە تـەیرەک و لەسەر سەری شێرزادی دەفـڕی رەخـشی کـۆنەش بەبێ سـوار بە دوایان کـەوت کـە گـەیشـتـنە نزیـکی مـەیدانـێ دیتی وا پاڵـەوانی کـافـر گـورزی بڵند کـردیە لەسـەری نیـقـاپـۆشی بدانیقاپۆش زانی ئەو گورزەی لێ بداکۆتـاییە گۆتی ئەی هاوار لە خۆم بێ کەس

و مالو ێرانێ خەمی مردنی خۆم نیە خەمی ئەوەمە حەیاشم چو لەدەست کافران وەعدم پێ نەگەیشتە سەر لەگەڵ شێرزادی وای شێرزاد بۆ دواجار چاوم پێ کەوتبای ئەو جامردن حەق بوو ناحەق نەبوو وای شێرزاد ئەو دەقیقەیە لێرە حازربای لەو گورزەی کافری خەلاست کرد بام کە کافر گورزری هینا خوارێ لێی بداله پشتەوە ڕەقەی سوارەکی هات لەو مەیدانە وەعاردی کەوت نەیزانی چۆن نیقاپۆش لەبن ئەو گورزە لابدا یەکسەر هێرشی کرد و نیقاپۆشی لەبن گورزی کافری ڕفاند... کە گورزی کافری بە عاردی کەوت گەڕاوە پڕیدا سنگی کافری لەڕقان جەرگ و هەناوی دەرهێناو زگی دڕاند فڕێیدا ناو مەیدانێ هەتا هێزی هەبوو هاواری کرد پاشا ئیستا چ دەکەی لەدەستم خاکت دەتورەکان دەکەم لەدونیا بڵاو دەکەمەوە...(ماسرە) گۆتی نیقاپۆش بدە بەمن ئیستا چاکی دەکەمەوە گۆتی کەس نیقاپۆش چاک ناکاتەوە خۆم نەبی هەڵی گرت و بردیە ژوورێ گۆتی کەس نێتە ژوورێ لە ژۆرێ سەری خستەسەر چۆکی خۆی نقابی لەسەر سەری لابرد و فرمێسکی دەباراندن بەسەر دەم و چاوی نیقاپۆشی ئێوارە هات کەس نەچووە مەیدانێ ماسرەشی کردە حەرەس لە دەرگای گۆتی نەوەک بێنە سەرمان ماسرەش خۆی کردە پاڵەوانەک و شیری لە دەستی گرت لە دەرگای راوەستا تا بەیانی هەرسەری لەسەرسەری نیقاپۆش بوو سەر لە بەیانی نیقاپۆش چاوی بلند کرد پێکەنی گۆتی شێرزاد ئەوە تۆی گۆتی نیقاپۆش ئەتومای گۆتی مایمە بەس براو جەماعەتیش نەکوژراینە دزراینە بەس وەسیەتەکم هەیە شێرزاد ئەگەر مردم لێرەم مەشارەودبم بە ودمەملەکەتی خۆم لای داک و بابم پێیان بلێ من بویمە ئیسلام لە مەغرب زەمینی کوژرایمە... شێرزاد دەستی بەگریانێ کرد گۆتی شەرت بێ لەشەرتی پاڵەوانان خاک و مەملەکەتی وێران دەکەم سبەی بەس ئەتۆ چیت بەسەربێ... سبەینێ ماسرد هاتە ژۆرێ گۆتی بۆ نایەڵی من بیبینم ئەوە دەمری ڕێمکە من تەداوی بکەم شیرزاد گۆتی نابێ گۆتی کەواتە ئەوە ددەرمان تەداوی بکە بۆ نیوەڕۆ نیقاپۆش هەستاوە و دانیشت گۆتی ئۆخەی دەتوانم دانیشم ئیوارە هات ماسرە گۆتی شێرزاد شەوێ دی لێ نەگەڕام ئەو عەیارە بتدزێ هات من ڕاوم نا ئەو شەو زۆر وریانەبی دەتدزی ئەو ساحرە پف لە حەفت دەرگان بکات هەموو پێکەوە دەبنەوە شەوێ دێ گۆتی چارە چیە؟ گۆتی شێرزاد بەبیرتە لەسەر کانیەکەی خۆم کردبوود مارە زەردەکە گۆتی ئا گۆتی ئەو شەویش خۆم دەکەمە مارە

زەردەکە سەرم لەسەر دەرگادا دەنێم کلکیشم دەخەمە سەر سەری تۆ هەر کاتێ هات و لەمن تێپەری وەدەستی لۆ تۆ هێنا من کلکەکت لەسەر و چاوان دەدەم تۆبە ئاگادیێی یەکسەر بیگرە گۆتی چاکە شەو عەیارەکە هات وەک سێبەرێک چووە سەرسەری شێرزادی ویستی بیبا ماسرە کلکەکی لە دەم وچاوی شێرزادی داشێرزاد ڕاپەری جادو کەر ویستی هەلبێ ماسرە دەرگای لێ گرت گۆتی مەلعون بۆ کوێ... چۆن دەرباز دەبی... گرتیان سەریان بڕی بردیانە مەیدانێ لاشەیان لە لایەکی مەیدانی بەسەرسنگە کی چەقاندو سەری لەلایەک، ماسرە گۆتی شێرزاد من وادەچم براو جماعەتیش لە زیندانێ دەردینم بەدزی نۆ بەتداران خۆی گەیاندە زیندانێ چونکە جن بوو کەس نەی دیت یەکەم جار دیوەکانی لە زیندانێ دەرهێنا گۆتی شێرزاد دیارە ئەوانە زۆر بەوەفا بووینە لەگەڵ تۆ وادەچم ئەحمەدی براشت دەردێنم... زوو رۆیشت ئەحمەدیشی لە زیندانێ دزیەوەو هاتەوە لای شێرزادی گۆتی شێرزاد من واجەماعەتم لۆ هێنایەوە برام لۆ هینایەوە، نیقاپۆش چاک بوەوە من دەرۆم بۆلای باب و براو داک و مالێ خۆم من خێزانی تۆمە ئەوە ئەنگوستیلەم هەرکاتی پێویستت بەمن بوو ئەنگوستیلەی بادەمن لە پێشت ئامادە دەبم شێرزاد گۆتی خواحافیزت بێ بەیانی کە رۆژ لە بورجی منەوەر هاتە دەرێ شێرزاد نەعرەتەی لێ داهاتە مەیدانێ گۆتی کافر ئیستا شارت تەخت دەکەم چونکە سەنەدمان لەبەین هەبوو ئەتۆ بێ شەرتیت لەگەڵ من کرد، کە خەڵک تەماشایان کردديتيان واجادوکەر لەسەرسنگە دار لە مەیدانێ لاشەی هەلواسرایە گۆتیان پاشا ئەویشت چوو...
شێرزاد مانگەکی تەواو لە مەیدانێ دانەبەزی پاڵەوانی لێ خەلاس کردن نیقاپوش تەواو چاک بوەوە گۆتی شێرزاد ئەتو ماوەکی ئیسراحەت بکە ئەمن دەچمە مەیدانێ بانۆبەتی من بی ئەویش مانگە کی لە مەیدانێ دانەبەزی پاڵەوانی نەما پاشا بنێریتە مەیدانێ ئەو دوو پاڵەوانە بەجوتە بەناو شاری مەغرب زەمینێ کەوتن کلیسایان روخاندن مزگەوت و مێرابیان دروست کردن کیژی پاشایان لۆ شازادە ئەحمەدی هینا پاشاش پەتکەکی بەریخی لە ملی خۆی کرد هاتە لای شازادە شێرزادی گۆتی بمبەخشە شێرزاد گۆتی لۆ خاتری براژنم (ماهی ئەفرۆزە) دەتبەخشم بەلام دەبێ ئیسلام بی گۆتی وائیمانم هینا بەوخوایەی یەکە بێ شەریک ولامەکانە... پاشان لەوێ بەرێ کەوتن بەرەو ماڵ گەڕانەوە یەکەم جار بە مالێ (مریندی هینبدی) داهاتن چوار رۆژ لەوێ

ئیسراحەتیان کرد پاشان چوونە مالیّ (غەرافی) لەویّش چەند رۆژەک ئیسراحەتیان کرد دوعا خوازیان کرد (مریندو غەراف) گۆتیان ئێمە لەو شەڕانە لەگەلّ ئێوە بووین ئێستا چۆن لە ڕێگا بەجێتان دیلّین هەتا مالّەوە لەگەلّتان دەبێین ئینجادە گەڕێینەوە هەموو پێکەوە رۆیشتن لە ڕێگا لەرۆخی دەریایەک دانیشتن ئەو شەو لێرە ئیسراحەت دەکەین بەیانی دەرۆین کەمەک پشویاندا دیتیان شتەک لە ناوەندی دەریای پەیدا بوو شێرزاد گۆتی ئەمن دەچم بزانم چییە؟ شێرزاد خۆی روت کردەوە شیری لەدەست بوو زرێبەندی لەبەر بوو لەگەلّ تاجەکەی گەیشتە سەرپشتی نە هەنگ بوو یەکسەر نقومی ناو ئاو بوو شێرزاد کەوتەبن بە حران ئەولا شێرزاد ئەولا شێرزاد بووە پاریّ بەنانی (ماسرە) زانی هەموو دونیای لیّ گەڕا بە کاری خودای هیچ سۆراغی نەبوو چونکە جن بوو چوار شەو و رۆژ دەچووەبن بەحران هەر نەیدۆزیەوە (مربندی هیندی) و (غەراف) وتیان پاشی شێرزادی دونیا لە ئێمە حەرام بیّ سەری خۆیان هەلّگرت و بەدەو بەحران چونە خواریّ گۆتیان یان دەیدۆزینەوە یان ئێمەش شەرت بیّ لە شەرتی خودا هەتا مردن ڕوو لە ئاوەدانی ناکەینەوە دێوەکانیش هەریەک بەلایەکدا رۆیشتن ئەوانیش هەر ئەو وەعدەیاندا.

لەو جەزیرەی بەتەنها نیقاپۆش و (ماهی فرۆزە) و ئەحمەد مانەوە نیقاپۆش گۆتی بابگەینە مالیّ بابم لێرد عەیبە ئەمنیش بەجێیان بێلّم لەویّ ئەگەر پیاو بی بەخۆی دەریّ بڕۆ بابچینە دوای شوونی برام ئەگەر پیاویش نەبی بالەلای ژنی خۆی بی گەیشتنە شاری نیقاپۆشی (٣) شەوان لێی دانیشتن ئەو پیاوە نەیگۆت بابچینە دوو شوونی برام لێی پالّداوە شەوی چوارەم نیقاپۆش رەخشی شێرزادی دەرهێنا و کردیەیەدەک لە دوو رەخشی خۆی و گۆتی شەرت بی ئەمنیش دونیام لیّ حەرام بی پاش شێرزادی لە نیوەی شەویّ بە تەنها لە شار بەدەرکەوت... بێینەوە سەرباسی شێرزادی کە کەوتە سەرپشتی نە هەنگ و هەر رۆیشت نەهەنگ بردی تا لە جێگایەک تجارەک جماعەتی لەگەلّ بوو دیتی وا زەلامەک لەسەرپشتی نە هەنگی درێژکەوتوە گۆتی ئەو مەیتەم چ بەزیندی چ بەمردی بۆ بێننەوە یەکەک لەوان چوو مەیتەکەی هیناوە لای جماعەت کەدیتیان نە مردوە چاکیان کردەوە تجارەکە لێی پرسی کاکە بۆ کویّ دەچی چ کارەی گۆتی کاکە منیش تجارم پاپۆرم لیّ وەرگەڕا کەوتمە سەرپشتی ئەو نەهەنگەو نەمردم ئەوە خوا ئێوەشی بۆ من کردە (خدری زیندە) لێم پەیدابون و

رزگارتان کردم ئەی ئێوە بۆ کوێ دەڕۆن؟... گوتیان ئێمە دەچینە مەغرب زەمینێ لە دلێ خۆی گوتی ئەمن بچمەوە مەغرب زەمینێ هەر بە مندالآن دەمکوژن گوتی ئەگەر پێتان ناخۆش نەبی ئەمن لەوشارەی پێشمان دێمە خوارێ من نایەمە ئەوێ ئەوانیش ئیزنیاندا خواحافیزی لێ کردن و لەو شارە دابەزی... کەونە جلکەکی لۆ خۆی پەیدا کردو گەڕا لە ناو ئەوشارە قاوە خانە کی بچووکی دۆزیەوە لێی دانیشت قاوەکی خواردەوە دیتی کوڕە لاوەک لەوێ دانیشتیە کوڕە هەر تەماشای دەکرد پاشان لێی پرسی تۆ چ کارەی لێرە چ دەکەی گوتی کاکە من تو جار بووم پاپۆڕم غەرق بوو هەر هەندەم دیت وا لێرە لە کەناری ئەو شارەی هاتیمە دەرێ گوتی ئەتو ئیسلامی گوتی بەلێ گوتی دەناله و شارەی هەر من ئیسلامم ناویشم (سەعیدە) ئەوشەوە دەبی بێیە لای من شەو هاتەلای سەعید... کچی پاشای کارە کەرەکی هەبوو لە ناو شاری دەگەڕا ڕۆژی هەرچی شتی سەیر هەبا لۆ کچی پاشای دەکڕی دەیبردەوە بەیانی شێرزاد لەبەر دەرگای مالێ سەعیدی دانیشت بوو کتابەکی پێ بوو دەیخوێندەوە کەسەری هەلبڕی کارەکەرەکە لە پێشی ڕاوەستاوە... کارەکەر دیتی پالەوانەک لەوێ دانیشتیە تا سەکی زێڕی لەسەرە بەمالێ دونیایێ ناکڕێ و نا فرۆشترێ... ئەویش گوتی ئەی نەوجەوان ئەو تاسە نافرۆشی...
شێرزاد گوتی کەونە فاحشە کەس جلی لەبەرە خۆی فرۆشتیە تا من بیفرۆشم.
سەعید گوتی کاکە وسبە ئەوە کارەکەری کچی پاشایە گوتی هەرچی هەبی کەیفی خۆیەتی کچە گەڕاوەو لۆ کچی پاشای گێڕاوە کچی پاشای بەکارەکەری گوت مالەکە پێ دەزانی گوتی بەلێ گوتی لێ گەرێ ئەوشەو دەچم لە عەرزی دەدەم و تاس و زرێ بەندەکەی لێ دەستینم لۆ سەعیدیشی ئاقردەکەم...
بێینەوە سەر مەسەلەی نیقاپۆشی ڕۆبی ڕۆیی تا گەیشتە شارەکی...
لەقاوەخانەکی دابەزی قاوەکی خواردەوە، کە قاوەچی چاوی بە نیقاپۆشی کەوت ڕەخشەکی لەگەرە کە شێرزاد لە پاشای کوڕەی ستاندیە لە فکری خۆی گوتی ئەو ڕەخشە بەماری دونیایێ ناکڕێ و نا فرۆشرێ... باخەبەرەکی بدەمە پاشای ئەو ڕەخشەی لێ بستینی پاشا پالەوانەکی ناردە دوای گوتی بلێ عەیبە مێوانە و هاتیە لە قاوەخانەی دانیشتیە پێی بلێن بێتە دیوە خانی...
گوتی بەخوای قەوما تازە چارەم نیە ڕۆیشتە بەردەرگا و لە قەسری پاشای سەرکەوت کە پاشا ڕەخشی دیت وەخت بوو بالْ بگرێ لە خۆشیان زۆر بەخێری

هێناکـە چووە مـەجلیـسێ دیتی ئەوا هەزاران پاڵەوان لەمـەجلیـسێ پاشـای دانیـشتـینە ئەو تاق و دیوارە هەموی گـورزو شـیـرە هەڵوا سرایە پاشا پەلاری هاویشت و گۆتی پاڵەوان ئەگەر ئەتۆبە من بڵێی لەو هەزاران شیـرەیەک شیر بدە بەمن هیـچ منە تـی تیـدانیـیـە ،بەڵام ئەگـەر دوو شـیـرم هەبێ بە برایەتی شـیـرەکم لێ داوابکەی بتـدەمێ ئەوە منەتی تێدایە، نیـقـاپۆش گـۆتی عـەیبـە مەلعون پەلاران ماوێ بە پاڵەوانانت نەخوری کەس لە مالێ خۆی کەسی رووت کردیە! ئەو ڕەخشـەی دەبینی یەدەگە لە دوای مـن دەڕوات شای ئەسکەندەریش ناتوانی سواری بی ئەوە ئەسپی شێرزادیە لە پاشای کۆرەی ستاندیە... گـۆتی لێت دەسـتـێنم بەزۆر گـۆتی پوچ و نامـاقـولت کـرد لە دیوە خـانێ لێ یـان بوو بەشەڕ نیقاپۆش بەناو ئەوشارەی کەوت بەمانگەکی ئـەو شارەی تەخت و وێران کرد... شێرزادیش لە مالێ سەعیدی دانیشتبوو هەندەی دیت ڕەخشەک هات و سوارێکی لە سەرپشـتی بوو هێرشی کردەسەری سـوارەکە دابەزی گـۆتی پاڵەوان من کارەکەری خۆم نارد بوو لۆ ئەو تاس و زرێیەت پێ نە فرۆشت بوو، گۆتی بێ عـەقل کەس جلی بەرەخۆی فرۆشـتـیە تا من بیـفرۆشم گـۆتی لێت دەسـتینم گـۆتی نامـاقـولیت کـردیەک لەوی یەک لەوی کچی پاشـای نقابی پۆشی بوو خـۆی دە شێرزادی کرد شێرزاد بڵندی کرد و لە عـەزری داویـستـی سەری ببڕی... سەعـید گۆتی نەکەی ئەوە کچی پاشایە... خەبەر گـەیشتە پاشای گـۆتیان پاڵەوانەک لە مـالێ سـەعـیدیە کـچی تۆی لە عـەزری دا شەو دەورەی مـالێ سـەعـیدیان گـرت شـێرزاد بێ چەک و بێ ڕەخشە... بوو بەشەڕلێـیـان زۆری لێ کوشتن حیکایەت دووری بەنزیـک دێخی ماوەی (٨) مـانگان شـێرزاد بێ چەک و بێ ئەسپ شەڕی کـرد لەگەڵ ئەو شـارەی رۆژەک زۆر زەلیـل بوو لەدەست پاڵەوانەکی لە مـەیدانێ هەر ئیـستـا نا ئیـستـا دەکـوژرێ... دەستی بەمناجات کرد، خوایە یەک لە دوان یان ڕەخش یان نیقاپۆش نیقاپۆشیش لە ڕێیەکی گـەیشـتـە کاروانەکی گـۆتی کاکە چ هەیە لەو شـارە گـۆتیـان کـاکە ڕۆژەک کـابرایەکی تو جـار هاتە ئەو شـارە تاج و زرێیـەکی پێ بوو پاشـا ویـستـی لێی بسـتـینی ئەوە (٨) مـانگە شـەڕیانە دونێ ئێـوارێ کە ئێمە دەرچووین لەبن دەستی پاڵەوانەکی زۆر زەلیل بوو نەشیری پێ بوو نەگورزو مەتاری پێ بوو ئەویش بێگومان کـوژرایە پاش ئێمە گـۆتی خۆیەتی ڕکـێبـەکـی لە رەخشی داڕەخش فـڕی کە دابەزیە مـەیدانێ شـەڕی دیتی وا کـافـر گـورزی بڵند کردیە لەسـەری بدا ئەویش مناجات دەکات دەڵێ خودایە یا ڕەخش

یا نیقاپۆش یەکسەر نیقاپۆش هێرشی بردو شێرزادی لەبن دەستی فڕاند گەڕاوە پاڵەوانەکەی گرت و سەری لە لەشی وەکو بەرخ جودا کردەوە... شێرزادی بردوو سەری خستە سەرچۆکی خۆی کەدیتی نیقاپۆشە گۆتی هاتی شێرزاد گۆتی تۆ لەی خۆت کردەوە... بەیانی نیقاپۆش کەوتە ناو شاری بەماوەی مانگەک لەگەڵ شێرزادی شاریان و ێران کردو (سەعید)یان کردە پاشا. گۆتی ئەدی برام ئەدی جماعەتم گۆتی حارو مەسەلەو مقەدەر ئەو هایە ڕۆیشتن بە جووتە سوارە تا هاتنەوە شاری خۆیان لەوێ ذانیشتن گۆتی تازە ئیسراحەت دەکەین گۆتی ئیسراحەت و دانیشتن لەمن حەرام بی پاش (مەربەندی هیندی و غەڕاف و) هەرسێ دێوەکان بەیانی سواری ڕەخشی بوو گۆتیە نیقاپۆش بەدوام دانێی...
شێرزاد بە تاقە سوارە لێیدا ڕۆیشت کەوتەوە چیاو چۆلان گەڕاسوورا ڕۆژەک دیتی وایەکی پیس مووی سەرو ڕیشی لەبنی پێیانەوا لە بن شاخەکی کەوتیە بۆنی کرد یەکسەر چووەلای کە دیتی ئەوە غەڕافەکە غەڕافیش دەنگی ڕەخشی شێرزادی گوێ لێ بوو یەکسەر غاری داکە گەیشتە شێرزادی یەک سەعات شێرزادی ماچ کردو بۆنی کرد پاشان شێرزاد غەڕافی بردە سەرکانی و ئاوەکی، پێستی حەیوانی لەسەر سەری لابردو دەستە جلەکی کردە بەری لە پشتە خۆی سواری کرد گۆتی ئەدی مەربەندی هیندی گۆتی ئەویش بەدەو بە حران داڕۆیشت، ئەویشی بەهەمان شێوە دیتەوە ئەوانەی گەیاندەوە شارو گەڕاوە یەک مانگ تەواویشیی لە دێوان نۆڕی تا هەمووی دۆزینەوە گەڕاوە شاری بانگی بابێ خۆی کرد هەموو کۆبوونەوە، ئەنگوستیلەی بادا (ماسڕە) لەوێ حازر بوو ئەوی تری بادا کیژی شای پەریان حازر بوو باوکی گۆتی کوڕم لە پاڵەوانان ئاگاداری نیقاپۆشی بە لەژنان ئاگاداری ماصرەی بە شێرزاد گۆتی بابە نیقاپۆشیش ژنەکەوای گۆت هەموو تەعەجوبیان مادێوەکان و مربندو غەڕاف و هەتا ماصرەش لەگەڵ ئەحمەدی برای... شێرزاد هەرسێ ژنی لە خۆی مارەکرد (ماهی ئەفرۆزە)ش لە ئەحمەدی برای چونکە هێشتا مارە نەکرا بوو نەکرا بوە بوک دو خوشکی هەبوو هەتا ئەوان هاتنەوە گەورەببون یەکیان لە (مربندی هیندی) مارە کردیە کیان دا (غەڕافی) هەر یەکی ژنیان بۆ هەرسێ دێوان هێنا... شەوی یەکەم لە لایان ماوە بەتەنها یەک شەو لەگەڵ هەرسێکیان بوو بەیانی کە ڕۆژ داهات شێرزاد بانگی نیقاپۆشی کرد گۆتی ئەگەر کوڕیان کچمان بوو ناوی لێنێ (فرغندە قەدەم) من خواحافیز بۆ کوێ؟ گۆتی لە کاتی لێرە

ڕۆیشتین (ماهی ئەفرۆزە) لۆ ئەحمەدی برام بینین دێوەکانم ئەسیر کردن لە ڕۆیشتن گەیشتینە باغەکی گەورە گۆتمە ئەکوانی دێو بڕۆ لەو باغەی و شیەترێیەکی لۆ برام بینە ئەکوان چوو لەگەڵ دێوەکی لەوێ بەشەڕهات دێوەکەی کوشت دێوەکی دی هات ئەکوان لەگەری کەوتە شەڕ ئەکوان بریندار بوو منیش چوم دێوەکەم کوشت پاڵەوانەکی نیقاپۆش لەناو قەسرێ هاتە دەرێ گۆتی پاڵەوان زادەحەدوو جودی بابت نیە پاسەوانی من بکوژی لەگەڵی کەوتینە شەڕ لە عەردم داکە نقابم هەر زڕاند ژن بوو لێی گەڕام گۆتی پاڵەوان من کچی ئەو پاشایەم لەو شارە ناوم (بحریە)یە پاسەوانانی تر خەبەریان دا پاشای کە پاڵەوانەک هات کچی توی لە عەردی دا پاشا گۆتی کچی من و لە عەردی بدرێ برۆن بیهاوێنە زیندانێ من ئەو ژنەم بەجێ هێشت پەیمانیشم دایێ، کە گەڕامەوە لەگەڵ خۆمت دەبەم ئێستا ئەو کچە لەسەرەمن لە زیندانە داکیشیان لە ئاغاژنی دەرکردیە من دەچم ئەو کچەش دێنم چونکە وەعدم دایتێ... سواری ڕەخشی بوو لیێ دا ڕۆیشت لە پێش چاوان بزر بوو... ڕۆژ ڕۆیی ساڵ ڕۆیی نیقاپۆش زگی هەبوو کاتی گەیشتە وەختی خۆی شەو چووە ژۆرێ سێ دەرگای لەسەر خۆی کلیل دا هەر بەخۆی بووە مامانی خۆی حەملەکەی داناو ناوکی بڕی کچێکی زۆر جوانی بوو بەیانی کە ڕۆژ هەڵات منداڵەکەی داپۆشی و بردیە دیوانێ پاشای ئەحمەدیش هەر ئەو شەوە منداڵەکیان بوو ئەویش هێنایە دیوانێ پاشای نیقاپۆش گۆتی پاشام خۆش بی شێرزاد خورا مکەیەکی بووە هەر بەخۆشی ناوی لێنایە و وەسیەتی کردیە ناوی (فرغندە قەدەم) کوری ئەحمەدیشیان ناولێ نا (تەیمور) بەڵام ماصرە و کچی شای پەریان چ منداڵیان نەبوو ئەو کچە لەگەڵ ئەو کوڕە گەورە بوون کەس نایزانی کچە تەنها داکی نەبی ئەویش هەتالای باپیریشی نەی گۆت کچە کەتەمەنی گەیشتە ٥-٦ ساڵان داکی بانگی کرد گۆتی بزانە والله دەچیە مەکتەب لەوێ لە هەر جێیەک لە دەوت دەرچی بلێی کیژم سەرت دەبڕم تۆ کوڕی جلکی کوڕانیشت لەبەرە کەس نەزانی تۆ کچی گۆتی باشە دایەگیان... بەرەبەرە گەورە بوو فێری پاڵەوان بازی و ڕمبازی و سوار چاکی بوو هەموو دەرسێکی خوێندکە تەمەنی گەیشتە (١١-١٢) ساڵان فەرخە شێرەک بوو بەخۆی (منداڵ لەو داک و بابەی بی دەبی کوبی؟) بابێینەوە سەرمە سەلەی شێرزادی کە چووە شارەکەی لە قاوەخانە یەک دانیشت قاوەیەکی خواردەوە لیرەیەکی خستە ناو پیارەکەی ڕۆیشت بۆ ڕۆژی

دووەم هەروا ڕۆژی سێیەم کابرای قاوەچی دەستی گرت گۆتی کاکە ئەو شەو میوانی منی گۆتی باشە... شەو نانی خوارد گۆتی کاکە بەسەر هاتی تۆ چییە؟ بۆم باس بکە گۆتی ئەتو خواپەرستی یان بت پەرستی گۆتی کاکە ئێمە پینچ مالێن لێرە سێ برا و دو ئامۆزا خوا پەرستێن ئەگەر نا شار هەمووی کافرە، گۆتی چاکە، بەلام بەداخەوە ڕۆژێ هەتا ئێواریّ ئێمە داخ لە کچی پاشای دەخۆین گۆتی لۆ؟، گۆتی لە وەختی خۆی پالەوانەک بێرەدا تێپەڕی لە عەردی دا لەسەر دەستی وی بووە ئیسلام کە پاشا بەو مەسەلەیەی زانی کچی خۆی خستە زیندانێ داکیشی لە ئاغاژناتی دەرکرد ئەوە چەند سالە ئەو کچە زیندانیە داکی بە دەرۆزەو بە خزمەتی خەلکی نانی بۆ پەیدا دەکا نیوەی دەدا بە حەرەسەکان هەتا لێی دەگەڕێن بچی پاروە نانەکی بداتێ. گۆتی بەیانی ئەو زیندانەم پێ نیشان دە... گۆتی باشە (٣٠٠) پالەوان حەرەسی ئەو زیندانەیە، گۆتی هیچ نیە ئەتو لە دوور نیشانم دەو بگەڕێوە. گۆتی چاکە، بەیانی لەمالێ هاتنە دەرگۆتی ئەوێ هێ زیندانەکەیە و گەڕانەوە تا شەو داهات زۆر زۆر تەنگاو بووکە تاریک داهات سواری ڕەخشی بوو ناوی خوای هێناو هێرشی بردە سەر زیندانێ پاسەوان هاواریان کرد شەو گەڕنێیە پێش دەتکوژین، هیچ نەگەڕاوە گەیشتە ئەوێ و وەناویان کەت هەریەکی بردە لایەکی کەمەندی فرێدا خوارێ گۆتی (بەحریە) خۆت دەکەمەندی بێخە دەنگی ناسی گۆتی شێرزاد تازە کەبوومە ئیسک و پیست گۆتی دردنگە خۆت قایم کە کەمەندی هەر کێشا و هینایە دەرێ لە پشتە خۆی سواری ڕەخشی کرد چوو لەبن دیوارەکی دیتی دایکیشی لەوێیە ئەویشی هەلگرت و گورزەکی لە عەمباری پاشای دا ئەو زەخیرەو خواردنە بە گوڕێ وەربوو لە قەسرەکی دایانن و ئەوەش خواردن بخۆن هەتا من شاریان لێ و ێران دەکەم کەوتە ناو شاری دوو سالی تەواو شەڕی کرد لەوێ تا نزیک بوو شاریان کاو ل بکا... پاشا وەزیرەکی عاقلی هەبوو گۆتی پاشا ئەوە خەلاسمان دەکا لۆ ئەو خەلکە بێ تاوانە بە کوشتێ بدەین- گۆتی چ بکەین وەزیر گۆتی بڕۆنە لای و بلێین کاکە ئێمە تەسلیم بووین فەرموو چیت دەوێ وادەکەین ئێوارێ دەعوەتی دەکەین دەرمانی بێ هۆشێ لۆ بەخواردنێ دادەکەین کە بێهۆش بوو دەیخەینە زیندانێ و کچ و ژنی خۆشت چ لێ دەکەی لێ بکە پاشا گۆتی چاکە... پاشاوە فدەکی ناردە لای شێرزادی گۆتی کاکە لەسەر دەستی وی تەسلیم بووین چ بلێ ئامادەینە شێرزاد شەڕی ڕاگرت چووە دیوانێ

پاشای ئێوارێ خواردنیان دایێ دەرمانیان بە خواردنێ دا کرد کە خواردی شێرزاد بێهۆش بوو کەوتە گۆڕێ پەلیان بەست هاویشتیانە ناو زیندانی بەحریە و دایکیشی ئازاد کردن ئەوانیش بەدزی و بەبەرتیل خواردنیان لۆ شێرزادی دەبردە زیندانێ ماوەی (١٠) سالان شێرزاد لە زیندانێ بێ سەرو سۆراغ ماوە... کە (فرغندە) تەمەنی بوە (١٢) سالان هەر لەگەل تەیموریش بوو لە ڕاووشکار و پالەوان بازی ڕۆژەک گۆتی (تەیمور) وەرە بزانین من بە پاشای دەرێم بابە دایکیشم هەر پێی دەرێ بابە ئەتوش بە پاشای دەرێی بابە ئەحمەدیش هەر پێی دەرێ بابە، با بزانین پاشا بابی کامانە تۆ بڕۆیەخەی داکی خۆت بگرەو ئەمنیش هەروەها هەتا ئەو سڕرەمان پێ دەرێن... هەریک چووە مارێ خۆی (فرغندە) پرچی داکی گرت و سوراندی گۆتی هەتا نەرێی بابی من کامەیە بەرت نادەم... شیری دەر هێنا (تەیموریش) هەروەها ئەحمەد بانگی تەیموری کرد گۆتی کوڕم ئەتۆ حەقت لە فەرغندەی نەبی ئەمن بابی تۆمە (ماهی ئەفرۆزە)ش داکتە کە گوێی لەو قسەیەی بوو مووی وەک نەشتەر لە لەشی هاتنە دەرێ لەرقان نیقاپۆش فرغندەی گرت و سووراندی گۆتی نازانی بابی تۆ کێیە؟ بابت ناوی (شیرزادە) بابت ئەو بابە بوو کە (١٠) مەملەکەتی کاول کرد لۆ خاتری ئەحمەدی هەتا (ماهی ئەفرۆزەی لۆ هینا) بابت ئەو بابە بوو کە ڕەخشی لە پاشای دێوان ستاند، بابت ئەو بابە بووکە لە دەوی حوت و نە هنگان دەرباز بوو ئیستاش ئەوە دەساڵە بزرە چویتە فلانە شاری تەیموریش برات نیە تۆ بە تەنهای کە (فرغندە) گوێی لەو قسەیەی بوو بیری کردەوە نیقاپۆش گۆتی فرغندە دامە مێنی ئەوە ڕەخش ئەوە گورز ئەوە شیر بە تەنها بڕۆو بابی خۆت ببینەوە من لەبەر ئەوەی ئەتو مندال بووی نەرۆیشتیمە ئەتۆ ئیستا بڕۆ ئەگەر هەتا مانگە کی دی نە هاتیەوە منیش دەتگەمێ پاش شێرزادی منیش ژیانم ناوێ... وەکی ئەحمەدی مامت نانی بە حیزی ناخۆم... ڕەخشی حازر کرد بۆ فرغندەی سواری ڕەخشی بوو پێی لە ئاوزنگی نالێی دارۆیشت (تەیموریش) سواری ڕەخشی خۆی بوو لێی دا بەدوای فرغندەی دارۆیشت بە ئەحمەدی باوکی گۆت سەگباب ئەوە برای منە تۆ چی! بەدوام دابێی یان داوام لێ بکەی سەرت بەو شمشیرەی دەپەرینم ئەویش ڕۆیشت. پاشا تەنگاو بوو وەزیرەکی پیری هەبوو گۆتی پاشا ئەوانە مندارن هەندەک سواریان بەدوا دا بنێرد لەگەل وەزیرەکی لە ڕێی هەریەکە یەکە و دوو دووە بابگەڕێنەوە ئەوانیش کە دیتیان کەس نەمادە گەڕینەوەو

دەترسێن، پاشا هەندەک سواری بەدوا دانادرن لەگەڵ وەزیرەکی فرغندە لە سوارەکان گەڕاوە بە ناویان کەوت یەک دووەکی لێ کوشتن ئەوانی دی هەموو لە ترسان هەلاّتن وگەڕانەوە وەزیر نەگەڕاوە گۆتی کوڕەکانم من دێم خزمەتتان دەکەم من ریش سپیمە رێتان پیشان دەدەم بەهەر حاڵ وەزیر ئەوانی ڕازی کردکە لەگەڵیان بچی. ڕۆیشتن ماوەیەک هەتا گەیشتنە شارەکی بەرەو دیوەخانی پاشای ڕۆیشتن فرغندەو تەیمور نقابیان پۆشیە وەزیریش هەروەک خۆیتی... کەدانیشتن لە دیوەخانێ بەخێرهاتنیان کردن... ژنێ پاشای بانگی پاشای کرد گۆتی پاشا بۆنی کچی من دێ لەو میوانانە بۆنی نیقاپۆشی دێ پاشا لێیان بپرسە بزانە چ دەبی؟ پاشا لێیی پرسین، لە وەزیری پرسی ئەنگۆ چ کارە نەبۆ کوێ دەچن لەکێدێن؟ وەزیر گۆتی پاشا ئێمە لە خوێندن بووین ئەوانە قوتابی بوون منیش لە گەڵیان بووم ئێستاش دەڕۆینەوە وڵاتی خۆمان پاشاش بۆنی کچی خۆی دەکرد بۆیە باوەڕی نە کرد لە تەیموری پرسی تۆ ناوت چییە؟ گۆتی تەیمور گۆتی بابت ناوی چییە؟ گۆتی ئەحمەد داکت گۆتی (ماهی ئەفرۆزە) لە فرغندەی پرسی ناوت چییە؟ گۆتی ناوم فرغندەیە باوکم ناوی (شیرزادە) داکم ناوی نیقاپۆشە، گۆتی هەر نیقاپۆش و بەس چ ناوی دی لێ نیە گۆتی من هەر نیقاپۆشم زانیە هەتا بە کچی خۆشی نەگوتبوو ناوی (ماهی ئەفغانە) هەرچەندە بە بەریان داکەوتن بەلاّش بوو چونکە نیقاپۆش لەو کاتەی ئەحمەدی گەیاندە شاری بابی زیاتر کەس لە باب و داک و خزمانی سۆراخی نە دەزانی تا ئێستاش... پاشا گۆتی وەزیر نابی بەیانیش برۆن بەیانی لەلای من بن ئینجا برۆن باهەندەکی دی خزمەتتان بکەم قبولیان کرد بەیانی چوونە دەرێی شار لەگەڵ پاشاو وەزیران کورسیان ڕێز کردن لێی دانیشتن ژنی پاشا گۆتی پاشا پێیان بلێ بانقابی لەسەر ڕویان لابەن کە نقابیان لادا لە سەرسەریان فرغندە تەواو نیقابرەشی خۆیان بوو تەواو هیچ جیاوازەیەکی نەبوو گۆتی پاشا نە مگوت ئەگەر لەبن بە حرانیش بی هەرنەوەی منە لە ماهی ئەفغانە... لەمەیدانێ پاڵەوانان یاریان دەکرد پیستی گایان پڕی خۆڵ و بەرد دەکردو لە مەیدانێ بلّندیان دەکرد هەندەکان هەتا چۆکی بلّند دەکرد هەندەکان هەتا ناوقەدێ کەس لۆسەرسەری خۆی پێ بلّندنە دەبوو... فرعندە گۆتیە وەزیری من دەچم بلّندی دەکەم وەزیر گۆتی حەیامان مە بەخۆ ئەتۆ لەو پاڵەوانانە بە قوەتترنی پاشا گۆتی چ دەلێ وەزیر گۆتی پاشا منداڵە دەیەوێ ئەویش خۆی

تاقی بکاتەوە پاشا گۆتی بابچی مەیدانە بائەویش هەندەک یاری بکا لۆ خۆی و بگەڕێتەوە... فرغندە چووە مەیدانێ پیستی گای لە سەردەستی خۆی سوڕاند چەند جار پاشا گۆتی ماشاء الله عەینەن نیقاپۆش بەخوای هەر لەویە... پالەوانەکان هێواریێ گەڕانەوە پاشا گۆتی وەزیر بەیانی مادام هەردە ڕۆن یەک تکام هەیە لە گەڕانەوە دەبێ بێرەدا بێنەوە خوام هێنا ڕەجات وەزیر وەعدی دا پاشای، بەیانی دەستی پاشایان ماچ کردو سوار بوون ڕۆیشتن چەند ڕۆژەک ڕۆیشتن لە شوێنێک لەبن چیایەک کانی و ئاوەک بوو لێی دانیشتن... کە سەیریان کرد دێوەک هاتە خواری دارەکی گەورەی لە سەر ملی بوو هەفت کە لەشەحەیوانی بەدارەی وەکرد بوو ئەویش لە نزیک ئەوان لەسەر کانی و ئاوەکە لێی دانیشت و دارەکەی شکاندە سەریەک ئاگری کردەوە کەلەشە حەیوانە کانی پێست لەسەربەکە لی هینان و خستیە سەر ئاگرەکە سۆری کردنەوەو کەوتە سەریان شەش کەلەشی خواردبێ ئەوەی پشکەکی بداتەوان ویستی حەفتە میش بخوات فرغندە و جماعەتیش وا لە دیاری دانیشتینە زەقەزەقەی چاویان بوو لە برسان (فرغندە) هجومی کردە سەرێ و کە لەشەکەی بەدەستەکی لێ ستاند و لۆ جماعەتی فڕەدا بە دەستی دی شەڕی لەگەڵ دێوی کرد، وەزیر و تەیموریش والە ترسان ڕوحیان دەردێ فرغندە دێوی گرت ملی باداو ملی شکاند... کە لەشەکەیان خوارد وەزیر گۆتی بابە ئەوە نەوەی شەیتانیە لە داک و بابەکی وەیەکو پالەوان نابی... لەوێ ڕۆیشتن خوا جلەوی ڕاکێشان تا نزیکی ئەو شارەی بوون لە دووری شار لە ئەشکەوتەک لێیان خست فرغندە گۆتی ئیوە دانیشن من بە تەنها دەچمە ناو شاری، کە چوە ناو شاری لە قاوەخانەکی دانیشت قاوەکی خواردەوە دوو لیرەی هاویشتە ناو پیارەی قاوەچی چاوی پێ کەوت لێی پرسی کاکە ئەتو چ کارەی بۆ کوێ دەچی؟ دیارە نەجیب زادەی گۆتی برا لە کاتی خۆی پالەوانەک ناوی (شێرزاد) بوو سێ برا و بابی منی کوشتیە منیش وا دە ساڵە بەدوای دا دەگەڕێم بیدەۆزمەوەو بیکوژم ئیستاش ئەڵێن لەو شارە لە زیندانە بۆیە هاتووم لە زیندانیش یەک دووبەردی لەسەری بدەم و تۆلەی خۆی لێ بکەمەوە کابرا گۆتی کاکە ئەوە دەساڵە لەو زیندانەی دیلە کەس نیە لێی بپرسی ئەوە تۆ یەکەم کەسی بەلام نایەلن.

( ٥٠٠ ) پالەوان لە دەوری زیندانە گۆتی ئەچم ئیزن وەردەگرم لە پاشای بەلکو ڕێم بدا بچمە سەری دوو بەردی بەسەری دابدەم دوعا خوازی کردو

ڕۆیشت... لەلای قاوەچی گەڕاوە لای جماعەتی گۆتیان هاچت کرد گۆتی کەمەک سۆراخم کردیە، بەڵام ماویەتی من ئەوشەو بەتەنیا دەچم زیاتر سۆراخی دەکەم تابووە شەو نەیزانی چۆن کات دەڕوا- کەشەو داهات بەتاقە سوارە چووە سەرزیندان پاڵەوان بانگیان کردێ ڕوحت خەڵاسە نەیە پێش... فرغندە هێرشی کردنە سەرێ بەدەستەکی شەڕی لەگەڵ (٥٠٠) پاڵەوان دەکردو بە دەستەکی کەمەندی فڕێ داخوارێ هاواری کرد شێرزاد کەس جوابی نەداوە جاری دووەم بانگی کرد شێرزاد سەری هەڵبڕی لەو نەعرەتە و لەو دەنگەی کە گوێی لێ بوو زانی ئەولادی خۆیەتی... بانگی کرد (فرغندە قەددەم) هەی داک قەحپە تازە بەدوو سوراخی من دادێی کە لە زیندانێ هێسک و پیستم نەما گۆتی شێرزاد خۆت لە کەمەندی بێخە گۆتی تاقەتم نیە ئەگەر ناتوانی هەرم کێشی وازم لێ بینە بەرێمەوە ڕوحم دەردێ گۆتی شێرزاد خۆت لە کەمەندی بێخە شێرزاد خۆی لە کەمەندی خست فرغندە نەعرەتەی لێ داو هاواری کردپاکانی پاک پاکی منورەر بە خالقی شەوو ڕۆژ بە جقەی سەری ئەسکەندەر هەتانە کەومەسەر لاشەی تو دەست لە کەمەندی بەرنادەم ڕای کێشا لە زیندان کە بێهێنێنە دەر کافر هجومیان کرد شیرکیان لە کەمەندی داکە مەندپسا شێرزاد هارەی هات لۆبنی زیندانێ کەوتە خوارێ خۆشی شۆڕکردەوە فرغندەکە بیگریتەوە خەدەنگە کیشیان لە پشتی وی داو برینداریان کرد کە زانی بریندار بوو ڕکێبەکی لە رەخشی خۆی داو لە ناویان دەرپەڕی لەو لاوە نوشداروی هینایە دەرێ و بەبرینەکەی وەرکرد خۆی بەستەوە هەربەو شەوە هاتەوە سەرسەری بابی هاواری کرد دیسان شێرزاد خۆت لە کەمەندی بێخە شێرزاد گۆتی ماکەربریا لە نیقاپۆشی نەبای گۆتی بابە کەمەند پسا خەتای من نەبوو گۆتی ئەدی لۆ نیو سەعاتە بزر بووی گۆتی هیچ لێگەڕێ گۆتی (فرغندە) جاری دی سێ پەراسوم شکایە ئەو جارەی بەرێمەوە بەیەک جاری دەمرم ئەگەر ناتوانی لێم گەڕی با لێرە بمرم گۆتی بابە خۆت لە کەمەندی بێخە شێرزاد خۆی لە کەمەندی هێخست چەند کافر هێرشیان لۆ هینا بەلاش بوو شێرزادی لە زیندانێ دەر هێناو خستیە پێشە خۆی ڕکێبەکی لە رەخشی داو لە ناویان شێرزادی ڕفاندو دەرباز بوو بابی گەیاندە لای تەیموور وەزیری و کردیانەوەو تەداویان کردو جوانیان شووشت- شێرزاد گۆتی بڕۆ بەحریە و داکیشی دەرباز کە هەر بەوشەوە چوو بەحریەو داکیشی دیتەوەو هێنانی و گەڕاوە مەیدانێ ناو شاری هەتا بەیانی (٣٠٠) پاڵەوانی سەربڕی و

گەڕاوەلایان بەیانی چوو خانیەکی گرت بابی لێ دانا وەزیرو تەیموری لەلا بە جێهێشت و گۆتی بابە سەیری کوڕی خۆت بکە ماوەی یەک مانگ فرغندە لەو شارەشەڕی کرد ڕۆژەک لەناکا و سوارەک بەفڕین لە ئاسمانێ دابەزی چوو دەستی وەزیری ماچ کردو نێو چاوانی شێرزادی ماچ کردو تەیمور و فرغندەی ماچ کردو گۆتی کوڕم دانیشتە تەماشای پیرە داکێ بکە فرغندەش بە ئاوات بوو داکی لە شەڕی ببینی نیقاپۆش نەعرەتەی لێ دا کەوتە ناو شاری بە ماوەی (دە) ڕۆژان شاری وێران کرد گەڕاوە لای شێرزادی و جماعەتی گۆتیە شێرزادی پیرە کۆنە دیتت چۆن بووم لە مەیدانێ شێرزاد گۆتی هێشتا هێزو تاقەتت مایە... شێرزادیش وەخۆ هاتەوە هەستان ڕۆیشتن وەزیر گۆتی دەبی بەوشارەی دابڕۆین حارو مەسەلەی ئەو پاشایە ئەوهایە.

نیقاپۆش گۆتی فرغندە چیان گۆت فرغندە گۆتی گۆتیان داکت ناوی چیە: منیش گۆتم دەزانم ناوی نیقاپۆشە زیاتر من نازانم شێرزاد گۆتی خوا بتگری چۆن بە ئەولادیشت نەگۆتیە ناوم (ماهی ئەفغانە) گۆتی بەس: نارێم نابی کەس بزانی لەوێ سوار بوون هاتنە شارەکە لەوی لەگەڵ داک و بابی خۆی پیک شادبوونەوە گەیشتنەوە شاری خۆیان بەحریشی لە خۆی مارەکرد ئەوە بووە چوار ژن شەرعیش هەر چوار ژنی حەڵاڵ کردیە بەکەیف و خۆشی پێکەوە لێ دانیشتن چەند ئەولادیان بوو تا ماوەیەکی زۆر ژیان... منیش لەوسەری هاتمەوە... کارەشم دڕاو چم پێ نەبڕا.

*** ئەم هەقایەتەم لە سالێ (١٩٨٩) لە عەزیز حەمید بەگ وەگرت کەئێستا لە ژیاندا ماوەو تەمەنی نزیکی ٧٠ ساڵەو لە شەقلاوە دادەنیشی.**

هەبوو نەبوو پاشـایەک هەبوو دوو کـوڕی هەبوو لە دیوەخـانێ خـۆی دوو تەیری هەبوو بە خێوی دەکردن لە ناو دیوەخانێ جێی لۆ کردبوون چەند ساڵ بوو بە خێـوی دەکردن فـەرخـەیان لە دیوەخـانێ دەکـردن گـەورەیان دەکـردن فەرخەکان دەڕۆیشتن تەیرەکە دەمانەوە.

ڕۆژەکی پاش ئەوەی مێـیـەکە فەرخەی دەرینان مـرد... نێرەکـە زۆر کزو غـەمـبار بوو ڕۆژەکی پاشا تەماشای کرد نێرە کەش ڕۆیشـتـە دەرێ بزر بوو پاش مـاوەکی گـەڕاوە مێـیـەکی لەگـەر خـۆی هینا بوو مـێـیـەکـە هاتەسـەر هێلانەی ڕۆژەکی پاشا تەمـاشەی کرد مێیەکە فـەرخەکی کوشت و فڕەیدا دەرێ نێرەکە هاتەوە کە دیتی فەرخەکی کوشیـتە نێرەکە شێت بوو زۆری لە مێـیـەکـەی داپاش چەند ڕۆژی دی مـێـیـەکـە فـەرخـەکی دی کـوشت پاشا تەماشـادەکات... پاش ئەو بەسـەر هاتەی پاشا سوندی خوارد ئەمن ئەگەر ژنم بمری ژنی نایـنم لەبەر ئەوەی ئەو دوو کـوڕانە دەکەونە بن دەسـتی زڕداکێ ئەوهە دەیان کوژی گۆتمان پاشا دوو کوڕی هەبوون (قارەمان و ئەسغەر) پاش مـاوەکی بە کـارێ خـوای پاشـا ژنی مـرد... سـوندی خـواردیە ژنی نایـنی. وەزیری لێ خڕبوونەوە گـۆتیـان پاشا ئەتو هێشـتـا جاحێری ژنی بینە گـۆتی لەبەر خاتری ئەو دوو کـوڕانە ئەمن قـەت ژنی نایـنم بیـانهێـنـخـمـە بەر دەسـتی زڕداکی... وەزیرەکی زیرەکی هەبوو گـۆتی پاشـا ئەتو ئەو دوو کـوڕەی بێخـە مـەکـتـەبێ بانێننەوە مـارێ نەزانن ژنت هینایە، بەدزی وان ژنی بـینە هەتا گەورە دەبن پاشان با بزانن.

پاشـان پاشا قـەراری دا ژنێ بینی بەدزی قـارەمـان و ئەسغـەری، کە نابێ ئەوان بزانن هەر کەسی پێیان برێ لەسەری دەدرێ.... پاشا یەک دوو ڕۆژی پێچوو ژنی هینا قـارەمـان و ئەسـغـەریشی خسـتـە بەرخینندنێ لە مـەکـتـەبێ دەرسیـان دەخوێند... مـاوەکی ئەوها بوو پیرە ژنەک چوو قـسـەی لۆ زڕداکی کـرد پاشا دوو کـوڕی هەنە لە مـەکـتـەبەکی تایبـەتی دەرسێ دەخـوێنن ناویان

قارەمان و ئەسغەرە... رۆژەکی ژنەکە بە پاشای گۆت، پاشا ئەتو هیچ مندارت نینە گۆتی نا گۆتی با دوو کورت هەیە (قارەمان و ئەسغەر) سبەینێ ئەتو بمری ئەمن داکی ئەوانم نەیانناسم کو دەبی؟ دەبی بیانبینم بیانناسم هەرچەندی پاشا گۆتی نابی گۆتی دەبی هەر بیانبینم... سبەینێ پاشا کاغەزەکی لۆ مامۆستای وان نارد قارەمان و ئەسغەری بینە مارێ کاغەزەکەیان وەقارەمانی داوە، خوێندیەوە گۆتی ئەسغەر ئەو کاغەزە لە بابمەوە هاتیە لۆتوە دەرێ وەرنە مارێ ئەمن نایەم ئەتۆش مەچوو کورە ئەسغەر بچی زەرەر دەکەین مەچوو ئەسغەر گۆتی بابم کاغەزی ناردیە قسەی بابم نا شکێنم هەر دەچم هەر چەندی مامۆستا و قارەمان پێیان گۆت نابی بچی ئەمرێ بابم لەسەرچاوانم هەر دەچم... گۆتی نابی بچی لێیان بوو بەشەڕ ئەسغەر چوو مامۆستاش زۆرزان بوو لەگەری چوو لە دیوەخانێ وەسەرکەوتن چوە مارێ زڕداک لەوێ دانیشتبوو کە دیتی ئەسغەر وەسەرکەت لەبەری هەرستا ماشەڵڵا ئەسغەر چ جوانەکە مێوژی سۆر بخوا لە گەردنی دیارە یەکسەر زڕداک عاشقی بوو لەلای خۆی داینیشاند گۆتی مادام پاشا ئەو کورە نازدارەی هەیە لۆ ئەمنی لۆ خۆی دەخواست ئەمن بابی توم ناوێ ئەتوم دەوێ ئەسغەر گۆتی ئەستەغفیروڵڵا ئەتو داکی منی قسەی ئەوها نەکەی گۆتی بەخوای ئەمن بەس لۆتومە دەرگەی لەسەر ئەسغەری قەپات کرد یەک لەوی یەک لەوی پڕی دا ئەسغەری، ئەسغەر خۆی لەدەستی راتەکاند کراسی داکی هەموو دڕا قارەمانیش هاتبوو لەگەڵ مامۆستای لەدەرێ راوەستا بوون ئەسغەر پەلێ زڕداکی گرت تێیهەردا بە عاردی کەت پڕی دەوی خێن بوو پێلەقەکی لەدەرکەیدا دەرکەی شکاند چووە دەرێ کەدیتی قارەمان و مامۆستا راوەستاینە گۆتی ئەسغەر سواربە قەوما زڕداکیشی بەددوی پڕخێن بە کراسی دڕای غاریدا دیوەخانێ گۆتی پاشا مادام ئەتو ئەو کورە بێناموسەت هەیە لۆ هیناتەوە مارێ ئەگەر لەبەر دەستانی هەرنەهاتبام حەیای دەبردم پاشا دەستی لەسەر دەوی ژنەکەی دانا گۆتی وسبە حەیام مەبە دە پاڵەوانانی خوری گۆتی هەرئیستا ئەسغەرو قارەمانم بۆ بگرن بەمردی یان زیندی هەتا لە سێدارەیان بدەم قارەمان گۆتی ئەسغەر بابگەڕێینەوە پاشای لەوەزعەکەی بگەینین راستیەکەی پێبیلێین بابم بەبرام باوەڕ ناکا بابرۆین مامۆستاکەیان گۆتی ئەمن دەچم راستیان تێدەگەیەنم مامۆستا چوو گۆتی

پاشا ئەوە بوختانە بە کوڕی تۆ دەکەن...مامۆستایان هەردا دەرێ. ئەسغەر و قارەمان لێیاندا رۆیشتن شەویان بەسەر داهات منداربوون لەسەرکانیاوەکی دانیشتن ئەسغەر گچکەتر بوو گۆتیە قارەمانی برام ئەمن زۆر ماندیمە دەمەکی دەنووم قارەمان گۆتی برام ئەتوو بنوو ئەمن حەرەس دەبم بەیانیان ئەمن هەرستینە ئەمن حەرەس دەبم ئەتوش ئیسراحەتەکی بکە... نیوەشەو داهات قارەمان دری نەهات برای وە ئاگابینی بەیانیان دوو تەیر هاتنە سەرداریێ نیشتن پەری بوون یەکی گوتە ئەویدی ئەزانی ئەوانەکێنە لێرە؟ ئەوە کوڕی فلان پاشاینە زڕداکێ بوختان پێکردینە لەبەر بابی هەر هاتینە بیان گری دەیان کوژی بەس قارەمان، ئەسغەر کیهەی گوێی لێیە لە دوای مە تەیرەکی دی دێتە سەر ئەو دارەی بیکوژە سۆری کەوە ئەوەی سینگی بخوا دەبیتە پاشا ئەوەی پشتی بخوا دەبیتە قارەمانەکی ناودار... پاشی وان تەیرەکە هات قارەمان تیرەکی لێدا کوشتی و گۆشتەکەی سۆر کردەوە بانگی ئەسغەری کرد لەفکرێ خۆی وەی دانا گۆتی با ئەسغەر سینگی بخوا ببیتە پاشا ئەمنیش دەبمە پاڵەوان گۆتی برام تەیرەک هاتە سەر ئەودارەی کوشتم گۆشتم سۆر کردەوە فەرموو بخۆ ئەسغەر ئاگای لە هیچ نیە کەتە سەرگۆشتی سینگەکەی هەموو خوارد بەیانی ناوی خوایان هیناو رۆیشتن لە چیایەکی وەسەرکەوتن دیتیان خەڵکەکی زۆر بەژن و پیاو بە رەوڵای وان دێت قارەمان و پاڵەوانەکی گەلەک زۆریان لەگەر بوو کیژەک لە ناویان هاتە دەرێ گۆتی ئەتوو قارەمانی ئەوەش ئەسغەرە گۆتیان بابە ئەمە فەقیرین رێمان بدەن دەرۆین گۆتیان نابی کچەکە گۆتی قارەمان و ئەسغەر ئەمن چەند سارە برام لەو ئەشکەفتەی لە زیندانێ دێوی سپیە بەنگۆ نەبێ بەکەس دەرباز نابی دەبی برام هەر لۆ دەربازکەن چوونە سەر ئەشکەفتێ قارەمانی ئەسکەندەر نامەی وێ بوو لە ئەسکەندەر نامە نووسرابوو هەرچی بچیتە ناو ئەو ئەشکە فتەی بەساغی نایەتە دەرێ قارەمان گۆتی ئەمن دەچم هەر چەندی ئەسغەر گۆتی نابی قارەمان گۆتی هەر کەسێ برێ دەچم دەیکوژم قارەمان خۆی شۆڕ کردەوە خوارێ گەیشتە بنی دوو شێری دیت دەویان کردیتەوە تەلسم بوو خۆی لێلادان و گۆتی ئەوە تەلسمە لە دو وان دوو عەزیای دیت زانی ئەویش تەلسم بوو خۆی لەوانیش لادا چووە خوارێ دیتی ئەسغەر بەدارێ هەڵواسرایە لێیدە دەن گۆتی ئەوە تەلسمە ئەسغەر ئەوە لەسەرێیە خۆی

لەوانیش لادا چووە سەرکانییەکی دارەک لەوێبوو لێی نووسرابوو پالەوان زادەهاتی ئەو تەلسمەی بشکێنی، بەلام تەیرەک دێتە سەرداری کلیلی لە ملیە سێ تیرانی باوێ ئەگەر لەو کلیلەت دا ئەوە ناجح بووی ئەگەر نادەبیە بەرد، دیتی تەیرەک هات ناوی خوای لێهێناو تیرەکی گرتێ لێینەدا هەتا چۆکانی بووە بەرد تیرەکی دی هاویشتێ لێی نەدا هەتا ناو قەدی بووە بەرد گۆتی تازە هەر رۆیشتم بوومە بەرد با ئەو تیرەشی باوێمێ دیسان ناوی خوای هێناو تیری سێیەمی هاویشتێ لێیدا تەقەی کلیلێ هات بەر بووەوە غاری دا کلیلی هەر گرتەوە بووە تۆز و تەمتومان تەلیسم شکا وەختەکی دیتی سێ کەس خۆیان پێدا شۆڕ کردیتەوە بەژن و بە پیاو گۆتیان پالەوان زادە ئەتو لەکێ لۆمە هاتی ئەو تەلسمەت شکاند ئێمە هەریەک کوڕی پاشاو کچی پاشایەکین دێوی سپی ئەمەی لێرە بەند کردیە هەموی هێنانە دەرێ گۆتی شەرت بی ژیان لەمن حەرام بی هەتا هەمووتان نەبەمەوە لای کەسوکارتان هەموویان چوونەوە مالێ کوڕە کەی لەوێ ئیسراحەتیان کرد کچەکەی ئەوە لی گۆتی قارەمان ئێمە دوو خوشکین ئەنگۆش دوو برانە هەریەک مێردی ئەکەینە یەکی زێرو مارەکی زۆریشمان هەیە ئەنگۆ لێرە دەکەینە پاشا ئەوانە دەگەینینە لای کەسوکاریان قارەمان گۆتی ناوە لللا ئەمە پاشایەتیمان ناوێ ئەرێ دەرکەی خەزینەی پاشایان کردەوە پڕی زێروگەو هەر بوو زێری دێوی شپیشیان هەموو هینا گۆتیان ئەوەش بۆ ئێوەبی ئەمە پێویستیمان بەزێروگەوهەری نیە ئەو خەلکەیان هەموو بە کەسوکاری خۆیان شاد کردەوە رۆیشتن جووتە برا ماوەی حەفت شەوو حەفت رۆژان رۆیشتن لە دوور شارەک دیاریدا کەنزیک بوونەوە دیتیان ئەوشارە هەموو سپیە دارو بەردو دیوارو هەتا خۆلەکەشی سپیە لە شاری نزیک بونەوە دیتیان پالەوانەک بەرەو رویان هات چل پالەوانی لەگەل بوو گۆتی یاخوا بەخێربێن بۆ ولاتی ئێمە زۆر بەرێزو حورمەت بەرەو کۆشکی پاشایان بردن کوڕەکە کوڕی پاشای ئەو شارەی بوو ناوی (سەعید) بوو لە دیوەخانێ دایاننان نەقابیان پۆشی بوو (ئەسغەر) دانیشت قارەمان بەشیری لە پشتی راوەستا (سەعید) لە دیوەخانێ بابێ خۆبوو گۆتی پالەوانینە ئەمە کافرین قارەمان گۆتی ئەمەش ئیسلامین- سەعید گۆتی یاخوا بەخێربێن پالەوان کێ غەدری لێکردینە هەتا حەقویسێنین چیتان دەوێ هەتا لۆتان بکەین قارەمان گۆتی

پاڵەوان ئەمە پاڵەوانین پێویستیشمان بەلەشکرو قوەت نیە کەسیش ناتوانی غەدر لەمە بکات سەعید ئیزنی لە بابی وەرگرت گۆتی بابە ئەو پاڵەوانانە مێوانن ئەمن دەیانبەمە دیوەخانێ خۆم بابی گۆتی کورم میوانی مەنە عەزیزن فەرقی چیە بالای توبن سەعید کۆشکە کەی بە کۆشکی خوشکە کەی وەبوو خەبەری نارد هەرچی خواردن و تەعام هەیە دروست کەن میوانی زۆر عەزیزم هەنە ئەسغەر دانیشت قارەمان دیسان شیری لەناو دەستی بوو لەپشتی راوەستا سەعید گۆتی ئەسغەر دیارە ئەتوبرا گەورەی لۆیە قارەمان هەر راوەستایە دانانیشی گۆتی ناوە لڵا ئەمن برا گچکەمە ئەو برا گەورەیە بەس ئەوە عادەتیێ دەرێ ئەسغەر نقابی لەسەر سەری لابرد مانگەک لەبن هەوری هاتە دەرێ هەموو دەستیان رەقبوو گۆتیان ماشەڵڵا خودایە چت دروست کردیە خوشکێ سەعیدی کارەکەری نارد گۆتی برۆ لە کولانکێ سەیرکە بزانە سەعیدکێی مێوانە ئەوها ئەمەی مەشغول کردیە کارەکەر چووسەری دەکولانکێ نا ماشەڵڵا لە کاری خوای سەری رەقبوو لەوێ بە هەزار دوعا تاگەیشتەوە لای خانمێ گۆتی خانم ئەمن وەسفم پێناکرێ بە خۆت برۆ کە خانم چوو بووە بەرد لەوێ شیوی لە بیر چوو هەتا گەڕاوە شیو هەموو بە مەنجەرانەوە سوتابوو دیسان شیویان لێناوەو ناردیانە دیوە خانێ پاش نان خواردنی دیسان کچێ پاشای هاتەوە کولانکێ سەیری دیوەخانێی کرد کەدیتی ئەسغەر بەتەنێ دانیشتیە ئەویش سەری بلند کرد چاوی بەکچێ پاشای کەت تیری عەشقی لێیدا... سبەینێ پاشا خەبەری نارد ئەورۆ لە دیوەخانێ من مێوانن ئەسغەر خۆی نەخۆش کرد گۆتی قارەمان ئەمن نایەم. قارەمان زۆر لێی پاڕاوە کوڕە ئەسغەر دەبی بێی بێناموسی لەمە ناوەشێتەوە ئەمە نانو نمەکی ئەوانە مان کردیە گۆتی بەخوای ئەمن هەر تەماشەشی ناکەم ئەتو برۆ ئەسغەر خۆی هێخست. قارەمان بە نابە دری چووە دیوەخانێ پاشای. پاشا گۆتی ئەدی ئەوی دی لۆنەهاتیە گۆتیان وەڵڵا کەمەک نەساغە کچەش بە فرسەتی زانی سنیە شیوەکی هەر گرت بردیە دیوەخانێ برای ئەسغەری، قارەمان دلێ راچەنی گۆتی ئەچمەوە سەرەکی لە ئەسغەری ئەدەم کە چووە ژۆرێ دیتی کچەکە لەوێیە دەستەکی لە سنیە شیوەکەیدا کچەکە دەرپەڕی دەرگای داخست گۆتی پاکانی پاک پاکی منوەر بە خالقی شەوو رۆژ بە جقەی سەری ئەسکەندەر ئەو جارەی ئەو کردەوە قۆڕانە بکەی سەرت

بەو شیرەی دەپەڕینم گەڕاوە دیوەخانێ سەعید زانی- لە دیوەخانێ بوون
دیتیان سێ پاڵەوان وە ژۆرێ کەتن شمشێریان دەمەتر درێژ بوو زۆر بەبێ
منەتی قاقەزەکیان وە پاشای داوە پاشا تەماشای کرد لێی نوسرا بوو هۆ
پاشا کچی خۆت دەرازێنیەوەو ئەکەیە بووک سواری ولاخی ئەکەی لەگەڵ ئەو
سێ پاڵەوانەی لۆ کوری منی دەنێری ئەگەر نا خاکت دەتورەگان دەکەم پاشا
سوجدەکی لۆ نامەی پاشایەکەی برد گۆتی باپرسی وەزیرو سەعیدو
مێوانانیش بکەین هەموو گۆتیان پاشا ئەمە شەڕی ئەو پاشایەن پێناکرێ
چی گۆتیە وابکە پرسیان بە ئەسغەری کرد ئەسغەر گۆتی ئەمن حەقم نیە
پرسیان بە قارەمانی کرد گۆتی پاشام خۆش بی ئەتو ساحبی عەرزو ناموسی
کوکچی خۆت تەسلیمی ئەو سێ دەم ڕوتەی دەکەی ئەگەر لە ڕێی شتەکیان
لێکرد لۆ پاشای بنوسە پاشا ئەمەش پاشاینە ساحب عەرزو ناموسێن لە
شکرەکی بنێرە کورت بنێرە لە گەریان کچی من پێشکەشی کوری توبی
بەتەدارەک تەسلیمی دەکەین ئەمە کو خوشکێ خۆت تەسلیمی پاڵەوانی
تودەکەین مەجلیس گۆتیان ئەشهەدو مابیلا قسەکی جوانە ئەوە قسەی
پیاوانە، نامەی نوسی پاشای سەعیدی لەگەر قاسدان نارد قارەمان گۆتی
ئەمنیش دێم قارەمانیش چوو، بەلام ئەسغەر کوڕە حەیام نەبەی نەکەی شتی
غەلەت بکەی پاشان ناومان دەکەوێتە ناو ئەسکەندەر نامەی هەموو دنیا
دەزانی ئەسغەر گۆتی غەمت نەبی سەعیدو قارەمان لەگەر قاسدان گەڕانەوە
سەعید گۆتیە قارەمانی ئەمن چم کرد ئەتوش وەبکە هیچ ورتەی نەکەی
گۆتی باشە گەیشتنە دیوەخانێ پاشای سەعید لە دەرکەی لەسەر چۆکان
سوجدەی برد لۆ پاشای هەتا گەیشتە بەرپێی یەکسەر تەختی ماچ کرد
قارەمان لە دەرکەی چەقی گۆتی ئەمە بەس سوجدە لۆ خوای دەبەین عەبد
چیە هەتا سوجدەی لۆ ببەین پاشا کەسەیری کرد قارەمان لە دەرکەی چەقیە
گۆتی سەعید ۆک ئەوەی لەگەرت سوجدەی لۆ من نابا ؟ سەعید گۆتی پاشام
خۆش بی ئەوە مێوانە ئەوەش نامەی بابم، پاشا گۆتی سەعید نامەم ناوێ
لێرە دامەنیشە نانیشت نادەمێ هێوارێ دەچیەوە ئەو کوڕە لە مەملەکەتی
بمێنێ و ێرانتان دەکەم شەوێ خوشکی خۆت دەکەیە بووک و دەیهێنیە ئێرە
سەعید تەمەنای کردو گەڕاوە... گۆتی قارەمان چتکرد پاشا عادز بوو
رۆیشتن لە نزیک دەروازەی شاری قەسرەک هەبوو بەتەنێ حەفت قات بلند

بوو خەتەکی لە دەورەی کرابو سەعید گۆتی ئاخ، قارەمان گۆتی ئەو ئاخەت
لە چ بو گۆتی لێم گەڕێ قارەمان بابمرم بەتەنێ خەفەتی لە ناو سینگی منە
گۆتی بەخوای تاکو تەنیا ئەگەر پێم نەرێی لێرە نا ڕۆم گۆتی برام چت لێ
بشارمەوە ئەوە قەسرێ کیژی پاشایە چەند سارە ئەمن بەتەمای ئەوم پاشاش
نامداتێ لە پشت ئەو خەتەی حەفتا پاڵەوان حەرەسە گۆتی لێرە راوەستە
ئیستا لۆت دەینم گۆتی قارەمان لە رێی خوای تازە پاشا ئەمەی دەر کردیە
ئەوەش بزانی مەملەکەتمان و ێران دەکات گۆتی بە خالقی شەو و رۆژ لێرە
نارۆم هەتا لۆت نەینم... قارەمان ناوی خوای هیناو لەخەتێ پەڕیەوە.
پاڵەوان بانگیان کرد شەو گەڕنێیە پێش روحت خەلاسە قارەمان نە گەڕاوە
هەتا دەرگەی قەسرێ سێ خەدەنگیان لێدا لەشی هەموو زرێبەند بوو هیچ
کاری لێنە کرد گەیشتە دەرگەی دەستی درێژ کرد لۆ پاڵەوانی دەرگەی گرتی
بە دیواری دادا حەیاتی لێبڕی وەسەرکەت گۆتیان ئاغەژن سوارەک
وەسەرکەت گۆتی ئەدی پاڵەوانی دەرگەی لە کێیە کەدیتیان گۆتیان وەڵلا
پاڵەوانی کوشتیە وەسەرکەت قارەمان گۆتی کامە کیژی پاشایە گۆتی ئەمن
هەوم دەستی گەیاندێ و هینایە خوارێ لە پشتە خۆی دانا لە رەخشی سوار
بوو هاتەوە لای سەعیدی ئەویش وەک بی ناو ئاوێ دەلەرزی لە ترسان،
کچی پاشای گۆتی ئەوە چییە؟ قارەمان گۆتی ئەمن ئەتوم لۆ (سەعید)ی
هینایە... کیژی پاشای گۆتی گوی خوارد سەعید کەنگی ئەو پیاوەیە ئەمن
قابلی ویبم ئەوانە هەر خوارمێ مەبووینە... قارەمان گۆتی ترە ترێ مەکە
ئەو شەو دەتبەم لۆ سەعیدی دەتکەمە بووک، لەولاش خەبەر لۆ پاشای چوو
کە کیژی تۆیان برد پاشا جارێدا لە شکر ئامادە بوو هێرشیان کردە سەر
قارەمان و سەعیدی... پاشا گۆتی راوەستن ئەوها نابی ئەوە عادەتی
پاڵەوانان نیە... عادەتی پاڵەوانان دەبی یەک یەک بچینە مەیدانێ. لێنە
گەڕین ئەو سەگبابانە دەرباز بن خەبەری لۆ بنێرن سبەینێ مەیداندارییە ئەگەر
پاڵەوان بی ئەوە قەبولی دەکا ئەگەر نادەیا نگرین دەیا نکوژین لۆ پاشاش
ئاقریان دەکەین گۆتیان باشە خەبەریان لۆ قارەمانی نارد قارەمان گۆتی ئەوە
شەرتێ پیاوانە سبەینێ پاڵەوانبازییە... سبەینێ تەپلی شەڕی لێدرا بە
ناوێ قارەمانی جواب دراوە ئەو رۆژە لە مەیدانێ قارەمان چەند پاڵەوانی
سەر بڕین لۆ ماوەی یەک مانگی قارەمان لەو مەیدانەی شەڕی کرد بەتاقە

سواره سەعـیـدیش لە ترسـان روحی لەبەر نە مـابوو... خێـمە و خـواردن و تەرتیباتی شەڕیش هەموو پاشا دەیدا... سەعید گۆتی زۆر عەیبە لۆ من ئەو کابرایە ئەوە یەک مانگە بە تاقی تەنیا شەڕی دەکات گۆتی قارەمان سبەینێ ئەمن ئەچمەمـەیدا نێ یەک دوو رۆژان سـەعـیـدیش چووە مـەیدانێ چەند پاڵەوانی کوشتن سبەینەکی پاڵەوانەکی لۆ هاتە مەیدانێ سواری فیـلان ببوو قارەمان گۆتی خودایە بەس لە و پاڵەوانەی سەعیدی دەربازکەی شەرمەزاری پاشا و دنیاو قـیامـەتان نەبم... سەعـید چووە مـەیدانێ لۆ ئەو پاڵەوانەی هەتا هێوارێ شەڕیان کرد سەعـید زۆر زەلیل بوو لە دەستی قـارەمـان گـۆتی خودایە لۆ خاتری هەموو خۆشە ویستانت ئەو ڕۆسەعید لە دەستی خەلاس ببی سبەی بەخۆ دەچمە مەیدانێ سەعـید بەهەر نەوعەکی بوو ئەو رۆژە لە دەستی دەرباز بوو کەس کەسی پێ نەبەزی سبەینێ کە رۆژ لە بورجی منەوەر هاتە دەر... سـەری چیـایان زەرد بوو بنیـان رەنگا و رەنـگ بوو چێـشـتێ پاڵەوانان خـورا کـافـر هاتەوە مـەیدانێ ئەو رۆژەی قـارەمـان لۆی چوە مەیدانێ... کافر کەدیتی پاڵەوانی دونێ نیە گۆتی پاڵەوان ئەمن پاڵەوانی دونێم دەوێ... قارەمان گۆتی کافر تڕە تڕێ مەکە ئەوی دونێ برا گەورە بوو ئەمن برا بچووکم هەر وەختەکی ئەمنت کوشت ئەویش بکوژە... ئەسغەریش لەولای لێ دانیشـتیـە نەبرای وەبیرە نە کـەسی وەبیرە لە کـەیفـو رابواردنێ دایە... کـافـر گـۆتی پاڵەوان جـوانوجـاحێـری یەک گـورزت لێدەم لە قـاڕی زەمـینت بزر ئەکـەم وەرە خـوارێ سوجدەی لۆبت و سـەنەمی من ببـە کـافـر سواری فیلان بوود بتوسنەمی لە تەنیشتە خۆی دانایە... گۆتی پاڵەوان وەرە بتکەمە برایەکی خۆم بابە دەستی من نە کـوژرێی حەیفە! قـارەمـان گـۆتی حەددو وجودت نەبی کافر گوی بخۆ وەرە ئەتو سوجدەی لۆ خوای بێ شەریکو گەورە ببە، ئەو خودایەی ئەتۆو من و هەمو دونیای دروست کردیە کافر ئەو خوایەی کە ئەو هێزو قـوەتەی بە تۆدایە بتوسەنەم چیە سوجدەی لۆ ببەی کافر گۆتی قارەمان لۆ خاتری بتوسەنەمان مەجالت دەدەم گورزی خۆت بوە شێنە چونکە هیچ پاڵەوانەک نیە ئەمن گورزم لێدابی گورزی دوەمی لەگەر بە کـار بینم قارەمـان قاقا پێکەنی گـۆتی کافر گورزی یەکەم لۆ کافرانە گـورزی خۆت بوەشـێنە ئەو جـاگـورزی پاڵـەوانانیش دەبینی... قـارەمـان مـەتاری لەسـەر سەری دانا لە بن نقابی مناجاتی خوای خۆی کرد کافر هاتو چو دوسەران لە

مەیدانێ گورزی سەدباتمانی برند کرد گورز وەک کورەی حەدادان ئاگری لێدە
باری وەک گوجیلە سەگی نورە نورێ دەهات کە گورزەکی لەسەرێ قارەمانی
دا ئەگەر لە کێوی ئەلبوورزی دابا تەختی ئەکرد هەندە بەقوەتی لێدا قارەمان
گۆتی پەککو جاری پێچوبم ئەو جارەیە دونیا بو بەتەم تومان کافر لە فیلان
دابەزی بوو لە ناو تۆزێ لە پارچە گۆشتەکی دەنۆرێ لەبن کلۆرایی ددانی بنێ
قارەمان مەتاری دەملان کەتبوو تەکانەکی خۆیدا لەناو تۆزو غوباری هاتە
دەرێ سەرە ڕەمەکی گەیاندە قونێ کافری گۆتی ها کافر ئەوە لە چ دەگەرێی؟
گۆتی پالەوان ئەتومای؟ گۆتی پەککو بەمنداری لەگەڵ مندالە هێتیمەکی
بەشەر هاتم داکم تیرۆکەکی لەسەری دام هەندی گورزی تۆ هێشا کافر
دەمارێ قونی پسا لە ترسان گۆتی پالەوان نۆبەتی توە قارەمان نوشداروی
وێ بوو خستیە بن کونە کەپوی خۆی هۆشی تەواو هاتەوە بەرێ سێ سەران
لە مەیدانێ هاتوو چوو گۆتی پاکانی پاک پاکی منەوەر بەخالقی شەوو رۆژ
بە جقەی سەری ئەسکەندەر ئەگەر ئەتو لەبەر گورزی من دەرباز بی قەت
بەمن مەرێ پالەوانێ سەعیدی خۆی کردە پالەوانێ سەعیدی... قارەمان
گورزی سەد باتمانی برند کرد وەک کورەی حەدادان ئاگری لێدە باریکە لەسەر
سەری سوڕاند دوو سەران هاتو چوو ئەسپ هەر دوپیێ هاویشتنە سەر
تەختەو رەوڕەوان. هەتا بەقوەتتر لێی بداکە گورزی فەرقی سەرێ کافری کرد
دونیا بو بە بەرق و هەورە ترشیقە کافر نە مەتاری دەملی مانە شیرو تیر بە
روتوو قوتی لەو مەیدانەی ماوە قارەمان شوکرێ خوای کرد لۆ ئەو گورزەی
کە لە کافرە کەیداکە دیتی کافر نە مردیە دوسەران لە مەیدانێ هاتوو چوو
کافری برند کرد لەسەر تەختەو رەوڕەوان لەسەر دەستێ خۆی سوڕاند گۆتی
جیهان جام و فەلەک ساقیو ئەجەل نەی خەلاس ئیبادەی مەرگت مەلعون
جامی شەڕابی مەرگت لە دەستم وەرگرە لە ڕکان هەندە بە قوەت بە عاردیدا
داحەفت گەزی عاردێ قۆر کردن هەری کێشا هەر ماسی کەزگی هەربدرێ
مەلعون ئاهەکی هەر کێشا دوو دلۆپە فرمێسکی لە چاوان هاتنە خوارێ
قارەمان گۆتی مەلعون پالەوان کو لۆ پشکە خینەکی ئەگریێ گۆتی پالەوان
دیارە خوای تو حەقە و بێشەریکە ئەگەر نا ئەمن بە کەس پشتم وەعاردی
نەکەیتە ئەمن ئیمانم بەخوای تو هێنا قارەمان برندی کردەوە ناردیە وەلای
سەعید ولای کیژێ پاشای چوو لە تەنیشت کیژێ پاشای دانیشت سێ چار

رۆژی دی بەو نەوعەی چوە مەیدانێ هەمو لەشی بوە برین رۆژەکی لەبەر دەستێ پالەوانەکی زۆر هیلاک بوو... شەوێ ئەسغەر خەونی دیت دیتی قارەمانی برای کەتیتە ناو گۆمەکی خینێ هەتا ملی هاتیە وەختە بخنکێ لە خەوێ راپەری هاواری کرد، حەرەسان گۆت چبو؟ گۆتی برام دە هیلاکەت دایە رەخشم لۆ بینن سواری رەخشی بوو گۆتیان ئەوەرێیە رەخش فڕی قارەمانیش دەیگوت خودایە بەس ئەو جارەی چاوم وەچاوی ئەسغەری برام کەتبایە بابمرد بام سوم لە خۆ نەبوو لە مەیدانێ قارەمان لە دەستی پالەوانەکی زۆر هیلاک بوو نۆ بەتی کافری بوو گورزی لێبدا قارەمان گۆتی خودایە خەلاسم بکەی بەتەمای تو مەتاری دانا سەری کافر گورزی برند کرد ئەگەر لێیدا با روحی خەلاس دەبوو رەخشی ئەسغەری ڕمبەی هات لە پشت کافری وەعاردی کەت گورزی کافری لە هەوای گرت دەستی گورزی بە هەموشتەوە لە بنی دەرهینا شیرەکی لەسەری داکوشتی قارەمانی بە ئامێزی هەرگرت بردیەوە لای جەماعەتی نوشداروی لەبرینەکانی دا هەموو لەشی برین بوو گۆتیە کیژێ پاشای خزمەتی برای من دەکەن برام چیلێبێ شارو لێ وێران ئەکەم سێ برات هەیە هەرسێکیان ئەکوژم کیژی پاشای گۆتی پەککو ئەوە چەند مانگە قارەمان شەڕی دەکا ئەوە هەر بەرایە نەوعی قارەمانیش نییە... سبەینێ ئەسغەر چووە مەیدانێ گۆتی پاشا زۆر عەیبە جەنگی مەغلوبەت لە سەریەک تاقە پالەوانی کردیە دوو دوو بنێرە مەیدانێ... قارەمانیش شەوێ لۆ سبەینێ وەخۆ هاتەوە گۆتی کورسیەکم لۆ دانین هەتا تەماشای دەست و بازوی (ئەسغەر)ی برام بکەم ئەسغەر سوندی خوارد شەرت بی لە شەرتی پیاوان نابێ گورزی هیچ پالەوانەکی وەسەری من بکەوێ لۆ ماوەی حەفتەکی لە شکری پاشای تەفرو توناکرد شاریان گرت پاشا بەخۆو بەکوڕانی پەتکەکی بەرپخی لە ملێ خۆ کرد ئەسغەر عەفوی کردن ئیمانیان بە خوا هینا بوو نە موسلمان کچەکەیان لە سەعیدی مارە کردو گەڕانەوە بە بووکەوە لۆمارێ پاشای لەوێ گۆتیان پاشا ئەمە دەرۆین خواحافیز پاشا گۆتی راوەستن ئەمە قەرداری ئێوەینە سەعیدیش خوشکێ خۆی پێشکەشی ئەسغەری کرد ئەوانیش ئیسلام بوون دێرەو کەنیسەیان تێکدان مزگەوت و مێرابیان دروست کردن پاش ماوەکی خواحافیزیان لە پاشای کردبەرەو مەملەکەتی خۆیان گەڕانەوە قارەمان گۆتی ئەسغەر ئەنگۆ لە دەرێی شاری ئیسراحەت بکەن ئەمن دەچم بزانم وەزعی مەملەکەتی بابم چیە؟

کەخەبەرم نارد لەوکاتەی ئەنگۆ وەرن... قارەمان شڕە جلەکی لەبەر کرد چوە ناو شاری دیتی لەبن دیوارەکی پیرە مێردەکی دێوانە سەرو ڕدێنی هاتیە دانیشتییە، ناسییەوە وەزیری بابی بوو، بەڵام خۆی لێ ئاشکرا نەکرد گۆتی مامە ئەو شارە چ شارە؟ پیرەمێرد دمستی بە جونان کرد گۆتی کوڕم ئەو شارە شارەکی ئیسلام بوو پاشایەکی زۆر باشمان هەبوو ژنی مرد ژنەکی تری هێنا دوو کوڕی هەبوو زڕداک بوختانی بە کوڕەکانی کرد پاشا کوڕەکانی دەرکرد پاشان زڕداک لەگەر قولەکی رەش ڕێککەت پاشایان گرت هاویشتیانە زیندانێ قول لەسەر کورسی پاشای دانیشت ئیستاش سەد پاڵەوانی هەیە، کەوای گوت قارەمان موی لە شی وەک نەشتەر لەبن جلکان بڵند بوونەوە، بەڵام خۆی ئاشکرانە کرد گەڕاوە لای ئەسغەری بەسەر هاتەکەی لۆ گێرانەوە پێکەوە چونە ناو شاری بەرەو کۆشکێ پاشای وەڕێکەتن لەبەردەرگای پاڵەوان گۆتیان مەمنوعە قارەمان دوو پاڵەوانی گرتن لێکی دان روحی لەبەر بردنە دەرێ ئەسغەریش لە کۆشکی وەسەرکەت کە قولە دیتی هجومی کرایە سەر ویستی فیرار بکا بەڵام ئەسغەر گەیشتە سەری شیرەکی لەسەری دا کوشتی بەرەو زیندانێ رۆیشت بانگی کرد بابە جواب نەبوو جارەکی دی بانگی کرد بابە پاشا گوێی لە دەنگی ئەسغەری بوو گۆتی کوڕم هاتی گۆتی هاتم کەمەندی هاویشتە خوارێ گۆتی بابە خۆت لە کەمەندی بێخە بابی هەرکێشا باوەشیان تێککرد گۆتی ئەدی قارەمان گۆتی ئەوە لە دیوەخانییە، رۆیشتن قارەمانیان دیت لەوێ بابیان بردەوە سەرتەختی... ئەسغەر گۆتی بابە ئەوەش زڕداک بەخوای گەورە بو ختانی بە ئێمە کرد گۆتی کوڕم دەزانم گۆتیان ئەوەش ژنی خۆت ئەو جا ئەتو دەیکوژی بەرەڵای دەکەی کەیفی خۆتە! گۆتی کوڕم ئەو ژنەم لۆ چیە تازە... قارەمان گۆتی بابە عەفوی کەو مەیکوژە، بەڵام بەرەڵای کە بابڕوا لەو شارەی... زڕداکیان بەڕەڵا کرد بابیش تاجی خستە سەرسەری قارەمان بوو بە پاشا بوو بە شایی لەسەرانسەری وڵات هەموو لاییک شاد بوونەوە هەزار رەحمەت لە گوێڕا دێران بی....

*** ئەو هەقایەتەم لە (عەزیز حەمید بەگ) وەرگرت کە تەمەنی نزیکی حەفتاو پێنج ساڵە لە شەقلاوە دادەنیشی.**

هەبوو نەبوو لە شارەکی پیاوەکی گەلەک هەژارو دەست کورت هەبوو، هیچ کارو کاسبی نەبوو غەیری ئەوەی ئەچوو لە چیا بەپشتی خۆی داری دەهێناو لە بازار دەیفرۆشت هەموو رۆژیک بارێکی دار بەپشتی خۆی دەیناو لە بازار بەقرانێکی دەداو قرانەکەشی دەکردە مەسرف بۆ ماڵ و منداڵەکانی... دوو کوری هەبوو یەکیان ناوی (سەعد) ئەوی دی ناوی (سەعدون) بوو... کابرا رۆژەک لە رۆژان هێلانە تەیرەکی لەسەر دارەک دیتەوە لە کاتی دار کردن، دوو هێلکەی تێدا بوو یەکێ لە هێلکەکانی هێناوەو ئەوی تری بە جێهێشت، دارەکەی هێنا بۆ بازار بۆ فرۆشتن دای بەجوەک کە دوکانی لەو ێبووکە چاوی بە هێلکە کە کەوت سەری سورماو یەکسەر بە کابرای گوت ئەم هێلکەیە نافرۆشی کابرا گوتی جوە ئەو هێلکە بچووکە خۆی چیەو جودی چیە؟ جوو گوتی کابرا (٢٠) قرانت دەدەمێ... کابرا گوتی جوەی سەگباب قەشمەرێم پێمەکە. وتی (٣٠) قران گوتی برۆ تاگەیشتە (١٠٠) قران. کابرا گوتی بدە... جوە (١٠٠) قرانی دایە و هێلکەکەی لێوەرگرت... بۆ بەیانی دیسان بارە دارەکەی هێناو هێلکەیەکی تری [illegible] خۆی هێنا، دایەوە جوە بە (١٠٠) قران... ماوەیەک وەها رۆیی کابرا بەرەبەرە دەوڵەمەند دەبوو... فکری کردەوە بچێتە (حەج) رۆژێک بەیان چوو دیتی واتەیرەکە لە ناو هێلانەیە چووە نزیک و تەیرەکەی گرت، لە ماڵەوە داینا هەموو رۆژێ وەکو جاران هێلکەیەکی بۆ دەکردو بۆ جوەکەی دەبرد... رۆژەک بەژنەکەی گوت ئافرەت من فکری حەجم هەیە پێویستە زۆر زۆر ئاگاداری ئەم تەیرەبی جوەش دەناسی هەموو رۆژێ هێلکە کەبدە بە جوو(١٠٠) قرانیشی لێوەرگرە... پاش ماوەیەک کابرا رۆیی بۆ حەج... جوەش فکری کردەوە ئەو کابرایە پارەی منی خەلاسکرد من چارەیەک بۆ ئەم مەسەلەیدنە دۆزمەوە لە بنم دێنی، جوو هەستا پیرە ژنێکی دۆزیەوە ناردیە لای ژنی حاجی، گۆتی من فلانەکەسم هەندە هەندە دەوڵەمەندم ئەگەر هاورێیەتیم بکا ئەوە ماڵ و سامانی خۆمی دەدەمێ پیرەژن مستە

زێڕەکی لە جوی وەرگرت گوتی بەچاوان من بوت چارە دەکەم. چوە لای ژنی حاجی و پاش دانیشتن گوتی بو وابێ رەنگوسیسی؟ گوتی چوزانم لە خەمی خومو منداڵەکان و حاجی گوتی ئافرەت تو لەگەڵ ماڵو مێردی خوت بووی وەکو باغێکی ئاودارو خاوەن باغەوان... ئێستا تو ئاو لێبڕاوی خەریکە وشک دەبی، وتی داپیرە چارە چیە؟ گوتی روڵە فلانە کەس دەناسی؟ گوتی بەلێ دەیناسم... گوتی ئەو ئامادەیە خزمەتت بکات... لەسەرچاوی خوت دابنێ... ماڵوسامانی خوت هەمووی بداتێ بەس ئەتو وەعدە بدەی هاوڕێیەتی بکەی...

وتی داپیرە لەبەر حاجی چون دەبی دیسان من منداڵم هەیە... گوتی روڵە بەس ئەتو وەعد بدە من دەتانگەیەنمە یەک بێ ئەوەی کەس پێبزانێ... هەندی لەبن گوێی خوێند هەتا ژنەکە رازیبوو جوو دەهاتە لای بەدزی پیرەژن رێی لو خوش کرد... روژەکی جوو گوتی ئافرەت ئەتوو دەتەوێ هەر ئەوها بەدزی لەگەل یەک بژین یان بە تەواو وەتی لویەکدی بین... ژنەکە گوتی دەمەوێ بەتەواو وەتی لویەکدی بین حاجی بە جێدێلم... گوتی کەواتە ئەو تەیرەی هەتانە بو می بکوژیەوە جەرگ و سەرکەکەی بەشیوێ لومن لێنێ بێخوم ئەوە بەتەواوەتی دەبمەهی تو گوتی باشە چاوەڕوانم بە تابوت ئامادە دەکەم... بو روژی دوایی تەیرەکەی کوشتەوە وسەرو جەرگی دانا سەر قاپەپلاوەکی چاوەڕوانی کرد هەتا جوەدێت وەختی نیوەڕو (سەعدو سەعدون) هاتنەوە لە مەکتەب دیتیان سینیەک لەوێ دانرایە قاپە پلاوەکی لەسەرە کە لە سەریان هەڵداوە دیتیان گوشتی لە سەرە هەریەکە پارچەیەکی لو خوی برد (سەعد) سەرکەکەی خوارد (سەعدونیش)یش جەرگ(سەعد) گەورەترە فامی دەکرد بە (سەعدونی) گوت برام وەرە ئەوە بو مەنەکرایە ئەوە سڕەکی تێدایە وەرە باخوێشارینەوە بزانێن مەسەلە چیە؟ لە ژورێ خویان شاردەوە دیتیان جوو هات کە خواردنە کەی لو جووی هینا تەماشای کرد سەر کوجەرگی تەیرەکەی نەمایە یەکسەر چووڕان و شتی دی لو سور کردەوە بەلام جوەکە شەقەکی لەبەر سینیەکەی هەردا رێشتی گوتی لو ئەمن لە برسان دێمە ئێرە، ئەدی منداڕەکانت لە کوێن ئەوان سەرک و جەرگە کەیان خواردیە دەبی منداڕەکانت بگری و سەریان ببڕی، جەرگ و سەرکە کەیان لە ناوزگی دەربینی لومن جارەکی دی سورکەیەوە ئەوە ئەمن لو تومە ئەگەر نا هەر دوکمان دەکوژرێین گوتی باشە چووە سەربانی ژنەکە چاوەڕێی هاتنەوەی منداڕەکانی دەکرد، ئەوانیش لە ژورێ بوون (سەعد) گوتیە

(سەعدونی) برام بابڕوین دانشتنمان نەما لێرە بە هەر حاڵ خۆیان دەرباز کرد ڕۆیشتن لە شار چوو نەددرێ ماوەکی ڕۆیشتن گەیشتنە دوو ڕیانەکی تاتەبەردەکی لێبوو لەسەری نووسرا بوو دووبرا هەنە (سەعد) و (سەعدون) دێنە ئێرە لەو دووڕێیەی (سەعد) دەچتە ڕێگای ڕاست (سەعدون)یش دەچێتە ڕێگای چەپ... هەر دوو برا لەوێ دەستیان لە ملی یەکدی کرد زۆر گریان پاش ماوەکی دوعا خوازیان لێکدی کرد و یەکیان بە جێهێشت (سەعد) کەبرا گەورە بوو دەچوە ڕێگای ڕاست ڕۆیشت ماوەی چەند ڕۆژەکی گەیشتە شارەکی کە دیتی خەڵکە کە هەموو لە مەیدانی شار کۆبوینەوە ئەویش گەیشتە وێ لە یەکەکی پرسی چیە ئەو حەشامەتە لێرە کۆبوینەوە؟ گۆتی کاکە پاشا مان مردیە لێرەش واباوە (بازی دەوڵەت) هەردە دەنە ئاسمانێ باز لەسەر سەری کێ بنیشی ئەوە دەیکەنە پاشا ئەویش وەکی خەڵکی دی ڕاوەستا بازیان هەردا ئاسمانی باز زۆر گەڕاو سوڕا هات کتوپڕ لە ئاسمانی هاتە خوارێ لەسەر سەری (سەعد)ی هەرنیشت ئەوانەی لە تەنیشتی وی بوون گۆتیان سەگباب بڕۆ لێرە ئەوە بۆ مەهاتبوو کەوتە سەر سەری تۆ ناچار چوو لە لایەکی دوور لە خەڵکەکەی ڕاوەستا بازیان فرێداوە ئاسمانێ گۆتیان دیارە باز هەڵەی کردیە باز بۆ جاری دووەم گەڕا هەتا (سەعد)ی دیتەوە دیسان هەر لە سەر سەری وی نیشتەوە گۆتیان بابە دیارە ئەوە دەبێتە پاشای خۆمان، ئەو لەوێ بووە پاشاو دەستی بەحوکم وعەدالەتی خۆی کرد... بابگەڕێینەوە سەرباسی (سەعدون)ی برا گچکە ئەویش چەند ڕۆژەکی ڕۆیشت هەتا گەیشتە شارەکی لە دەرێی شاری دیتی چەند خیوەت و خیوەتگا هەردراینە هەریەک بە نەوعەکی ڕازایتەوە لە کابرایەکی پرسی کاکە ئەو خیوەت و خیوە تگایە چیە لە دەرێی شاری هەر درایە؟ کابرا وەڵامی دایەوە کاکە پاشای ئەو شارەی کیژەکی هەیە ئەوەندە جوانەهەر لە ناو قەدی خۆی پیشانی هەریەکەکی بدات دەبێ کیسەک پارەی بدات... ئەوانە هەموو کورە پاشانە لۆ دیتنی ئەو کیژەی هاتینە...(سەعدون)یش هەموو بەیانیەکی کە لەخەو هەڵدەستا کیسە پارەیەکی لە پشت سەری دانرابوو. (سەعدون) ڕۆیشتە لای وەستایەکی گۆتی کاکە خیوەتەکی لبادم لۆ دروست بکە، دەستە جلکەکی لباد هەتا پێڵاوە کانیشم هەتا ڕایە خیشم هەمووی ددبی لبادبی ئەودش دوو کیسە پارە وەستا بەماوەی سێ چار ڕۆژان هەمووشتەکانی لۆ ئامادە کرد...خێمەی لبادی خۆی

له ناو خێمه رەنگا و رەنگەکانی دی هەرداو لێی پارداو... پاش یەک دوو
رۆژی چووە بەردەرگای کیژی پاشای ئەویش لە قەسرێ خۆی لە پەنجەرەی هەتا
ناو قەدێ پیشانی (سەعدونی)ی داو خورامەکەی لە خوارێ کیسە پارەکەی
وەرگرت... (سەعدونیش) گەڕاوە ناو خێمە لبادەکەی خۆی بەرەبەرە هەموو ئەو
کوڕە پاشایانە پارەو ماریان خەلاس بوو هیچان پێنەما بەتەنێ (سەعدون)
نەبی هەموو رۆژێ بە دەستوری جاران دەهاتو کچی پاشای دەدیت، کیسە
پارەی خۆی دەدا، کیژی پاشای گۆتی ئەوە قەت بێ سەبەب نیە ئەو پیاوە ئەو
پارەیە هەموو رۆژێ لەکێ دەینی؟ ئەوە ماوەی دوو مانگە دەبی بزانم مەسەلە
چیە؟ بەیانی کە هەرستا پاش خۆپیشاندانێ سینیەک زێرو پارەی ئامادە کرد
دەستە سرەکی خستە سەرو بە کارە کەرەکەی گوت وەرە ئەوە بۆ کابرای لباد بەە
بلێ بابۆ خۆی ئەو خیوەتە لبادەو جلکە لبادانە بگۆرێ دەستە جلکو خێمەکی
جوانی پێبکری- کارەکەر هەرستا وشتەکەی لۆ بردکە چوەبن خێمەی سەلامی
لە (سەعدون)کردو راسپاردەی کچە پاشای پێراگەیاند (سەعدون) گۆتی وەرە
بە ئاغاژنت برێ باگوی بخوا بۆ خۆی ئەمن پێویست بە پارەو زێری وی نیمە،
ناشیا نگۆڕم هەتا ئاغاژنت بە بوکێنی نە هێنمە بن ئەو خێمە لبادەی بەلام کوم
پیگوتی ئەوهای لۆ بگێرەوە... گۆتی ئاغاژنێ ئەوە پارەو زێرەکەت،گۆتی بە
ئاغاژنن برێ هەتا نەیگوزامەوە بن ئەو خێمە لبادەی تێکی نادەم گۆتی باشە
برۆ پێی برێ کە رۆژی چار شەممە دەعوەتی منە لە مالەوە بۆ رۆژی چوار شەممە
(مام لباد) هاتو لە کۆشکی کیژی پاشای بە سەرکەوت دانیشت لەلای...
کیژەکە لێی پرسی (مام لباد) ئەتو ئەوماوەیە هەمووی ئەو پارەیە لەکێ دەیینی
هەربنی نەهات پاردی تو؟ گۆتی خانم ئەمن نازانم بەس ئەوەندەی دەزانم
بەیانیان کە لە خەو هەلدەستم کیسە پارەکم لە پشت سەری دانرایە چیتر نازانم
گۆتی سەبەبی چییە؟ گۆتی ئاغاژن جەرگی تەیرەکم خواردیە ئەگەر سەبەب
ئەوبی ئەگەر نا چ سەبەبی دی نییە؟ گۆتی چاکە با نا نەکە بخۆین ئاغاژن چوو
لەودیوی دەرمانی بێهۆشی لۆ دەخواردنێ کرد کاتی خواردن هات (مام لباد)
یەکەم پاروی لێدا لە تەختی کە تەخوارێ، بێهوش بوو لە پشتەوە جووتە
پێیەکی لە پشتی داو ئەوەی لەزگی بوو دەرپەڕی جەرگە کە کەتە ئەو گۆڕەی
ئاغاژن هەلیگرتەوە و شوشتیەوە و خستییە جێگایەک شار دییەوە، دەرمانی
بۆن خۆشی خستە بن کونی کەپوی وەهۆش خۆی هاتەوە گۆتی (مام لباد) لۆ وا

له هۆشخۆ چووی؟ گوتی ئاغاژن نازانم! رەنگه لەبەر بۆن و بەرامەی مالێ توبی گوتی دەبی پاش نان خواردن دوعا خوازی له ئاغاژنێ کردو رۆیشت لۆ بەیانی که لەخەوێ هەرستا دیتی چ پارەی له پشت سەری نییه گوتی بەخوای ئاغاژن کاری خوی کرد لەگەره من ئەمنی کوشت تازه ئێرەکه لکی منی نەما... رۆیشت به رێگایەکی بۆ ماوەی شەش حەفت رۆژان گەیشتە جەزیرەکی چۆلو بیابان بوو، دیتی سێ کەس لەگەریەک بەشەرِدێن هەریەک لەوی دی دەدات کەس نیه لێکیان بکاتەوه... ئەویش گەیشتێ گوتی کاکه ئەنگۆ سێکەس هەر سێکیش لێک دەدەن، هەر نەبی یەکەک بەرِەوانی بکات... گوتیان کاکه ئێمه سێ براینه بابمان که مرد له میراتی سێ شتی لۆ بەجێهێشتین یەکیان (کراوی سەخره جنه) یەکیان (هەمبانی تا موشامه) یەکیان (دار عەسای حەزرەتی سولەیمانه)... گوتی باشه ئەوانه لۆ چ باشن؟ گوتیان کاکه کراوی سەخره جنی هەر کەس لەسەری بکات کەس نایبینێ و دەرِوات ئەویش هەموو خەلک دەبینێ دوومیان هەمبانی تاموشام هەرکاتی زارکی هەمبانت کردەوه هەر خواردنەکی داوابکەی بۆت ئامادە دەبی سییەمیش دار عەسایه هەرکەسەک سواری ئەو دارەی بوو برێ (بسم الله الرحمن الرحیم) لەنیەتێ دەمەوێ بگەمەفران جێی ئەوه دەیباته ئەوێ (مام لباد) له دری خوی گوتی خوایدا پێی گوتن کاکه ئەمن دەبمه حەکەم گوتیان دەی ئێمه رازی دەبین گوتی کاکه سێ بەردم لۆ بینن ئەمن ئەو بەردانه فرێ دەدەم، هەرکەسەک زوتر بەردی هێناوه ئەوه باشه که دەدەمەوی ئەمن نازانم کامەیان باشه: گوتیان بەخوای فکرەکی باشه...سێ بەردەکەی هاوێشت... هەرکەسه غاریدا بەردی زوتر بێنێتەوه ئەویش کلاوی سەخره جنی کردەسەری هەمبانی تاموشامی له ملی کرد سواری دار عەسای سلێمانی بوو راوەستا گوتی با بزانم ئەوشته راستەکه گەرِانەوه کەسیان نەدی لەوێ گوتیان ئەو کابرایه چی لێهات؟ بەخوای ئەویش فێری خوی له ئێمه کرد ئەویش گوتی دیاره راستەشتەکه... گوتی (بسم الله الرحمن الرحیم) خوایه له نیەتێ بچمه سەر کۆشک و بالەخانەی کیژێ پاشای، فرِی چووه سەر کۆشکی کیژی پاشای لەوێ قادرمەی هەبوو پێدا چووه خوارێ دیتی ئاغاژن تازه له خەوی هەرستایه ئامادەیه نان بخوات ئەویش کراوی له سەره کەس نایبینێ چووه پێشوو ئاغاژن پاروەکی نه خوارد بوو که ئەو دەستەکی بەخواردنه کەیدا هیناو هەمووی خوارد ئاغاژن گوتی ئەوه

چ بوو وەرن خواردنم لۆ بیننەوە من تێرم نە خواردیە... خواردنیان جارەکی دی لۆ هێناوە (سەعدون) برسی بوو ئەو جارەش هەمووی خوارد... کچەکە سەری سوڕما گۆتی ئەتو عەشقی ئەو خوایەی کە تۆ ئەیپەرستی و هەموو گیانلە بە رێکی دروست کردووە ئەگەر خۆت ئاشکرانەکەی ئەتو چی؟ کڵاوەکەی لەسەری لابرد دیتی (سەعدونە)ئەی (مام لباد) ئەوە ئەتۆی؟.. بەڵێ ئەمنم پاش دانیشتن وقسەکردن چۆن هاتیتەوە و چۆن نەهاتیەوە؟ گۆتی ئاغاژن شتێکی سەیرم لێرودا... لەسەری هەتا بنی هەمووی لۆ گێراوە گۆتی ئەی کواشتەکان؟ گۆتی وەرە والە سەریانن چون تەماشایان کرد و گۆتی وەرە سوار بەکڵاوی لەسەر ناو هەمبانی لەمل کردو خانمی سواری دارعەسای کرد گۆتی (بسم الله الرحمن الرحیم) خوایە لەنیەتێ ببەیە بەینی حەفت بەحران کە لەگەڵ خانمێ دابەزی کەتەدەستبازی و سوعبە توو سەیرانێ سەری وە چۆکێ خانمی کردو خەوی لێکەت... خانمێ دەستی گێڕا بەردەکی پانی لەبن سەری داناو چۆکی خۆی لەبن سەری دەر هیناو دەستی گەیاندە کراوەکەی لەسەرێ خۆی نا هەمبانی لە مل کردو سواری دار عەسای بوو گۆتی (بسم الله الرحمن الرحیم) خوایە لە نیەتێ ببەیەوە سەر قەسرێ خۆم... خانم گەیشتەوە سەر قەسرێ خۆی شتەکانی هەڵگرتوو لەلای خۆی دانان (سەعدونیش) کە بەخەبەر هات دیتی سەری لە سەر بەردییەو نە خانم مایەو نەشتەکانی لە جێی خۆی پارداوە گۆتی بەخوای مردن لۆ من باشە:- لێگەڕێ بالێرە بمرم خوا ئەمنی لۆ ئەو بەرایانە دروستکردوە... لێی پارداوە لە ناکاو دیتی سێ تەیر لەسەر چلی دارەکەی نزیکی وی نیشتنەوە دەستیان بەقسەو گفتو گۆی کرد ئەو تەیرانە پەری بوون هەرسێک خوشک بوون، خوشکێ گچکە گۆتی خوشکان ئەنگۆ ئەو کابراییەی دەناسن دەزانن کێیە و چ کارەیەو لۆ کەوتیتە ئێرە؟ دوو خوشکەکانی تر گۆتیان نەخێر گۆتی من دەیناسم ئەوە (سەعدونە) کوڕی فلانە کەسی برای (سەعدی) پاشایە فلانە کچە پاشاوای بەسەر هینایە گۆتیان مادام دەیناسی لۆ چارەیەکی لۆ نا دۆزیەوە؟ گۆتی ئەمن رێی لۆ دادەنێم ئەگەر نە نووستبی گوێی لەمن بی... ئیستا ئیمە هەڵدەفڕین پەلکی ئەو دارەی هەندەکی لۆ دە وەرێنین باجوان خڕیان بکاتەوە و بیانکوتی لەسەر بەردەکی پان کە کوتای بالەبنی پێی خۆی بداکە دەچتە ناو ئاوێ هیچ نقوم نابی ئاوی بۆ دەبیتە دەشتوبیابان بادوو چیلکە داریش لەگەرە خۆی ببالە و دارەی لەهەر شتەکی بدا بلێ خوایە

دەمەوێ ئەوشتە ببتە ئەوشتە ئەوا دەبیتێ بەهەوەسی ئەو... پاشان تەیرەکان هەڵفڕین لە شەقەی باڵیان دا... یەکسەر (سەعدون) هەرستاو پەلکدارەکانی کۆ کردەوەو بە ردێکی پانی هیناو لەسەری دانا و جوان کوتای کەمەکی لەبنی پێی خۆیداو چووە تەنکاوێ کەدیتی وایە گەڕاوە ئەو جارەی هەردوو پێوقاچی تەواو چەور کردن سێ لکەداریشی لەودارەی هەڵگرتن بەسەر دەریاکاندا پەڕیەوە قۆناغ بە قۆناغ تاگەیشتەوە ماڵی خانمێ... خانمیش لەترسی (سەعدون)ی چل نۆبەتداری دانا بوو لە دەرگای قەسرێ خوێ، بیست لەوبەری بیستیش لەوبەری کە (سەعدون) گەیشتە لایان هەموو نوستبوون دوولکە داری هەریەک لە دەستەکی گرت لەولاو ئەولای ئەداو گۆتی خوایە لە نیەتێ ئەوانە ببنە ماکەرو ئەوانیش ببنە نێرەکەر، ئەوانی ئەوبەری بوو نەماکەرو ئەوانی بەرامبەر بوونە نێرەکەر بوو بەزەڕە زەڕلە نێو نێرەکەرو ماکەران بوو بەرۆژی حەشر بە خۆشی بە قادرمەیدا سەرکەوتە ژورێ خانمێ. کەدیتی خانم دانیشتیە سەلامی لێکرد خانم واقی و ڕماو گۆتی (مام لباد) ئەوە ئەتوی؟ بەئەشقی خودای کو گەیشتیەوە ئێرە؟ دیسان ئەتوکو لەو چل نۆبەتدارەی دەرباز بووی؟ گۆتی نۆبەتداری چی. گۆتی چل نۆبەتدارم دانایە گۆتی وەڵلاهیچم نەدیتینە غەیری ئەو کەرانە نەبی لەبەر دەرگای وازەڕە زەڕیانە گۆتی کەری چی؟ گۆتی برۆ تەماشاکەبۆ خۆت کە تەماشای کرد دەبینی رۆژی حەشرە هەر نێرە کەرەک بەدوای ماکەرەکی کەتیە... زانی مەسەلە چییە، گۆتی ئەدی توخوا کولەو دورگەیەی رزگار بووی؟ گۆتی حارو مەسەلەو حیکایەتم ئەوەیە. گۆتی ئەدی ئێستا نیازت چیە؟ (سەعدون) گۆتی وەرە لام بزانم چ نیازەکم هەیە چلە دارەکی لە خانمێ داو گۆتی خودایە لە نیەتی ببیتە هێسترەکی ماچە... خانم لە پێش چاوی وی بووە هێسترەکی ماچە هەر رۆژەی دەیدایەکەکی دەیگۆت لۆ خۆت داری پێبینە... بەڵام خواردنی مەدێ هەر هێسکە گۆشتی لە پێش دانێ... رۆژێ دوو جار سەری لێدەدا هەردەیگۆت خانم چۆنی؟ ئەویش دەستی لە سەرچاوی دادە ناو فرمێسکی دادە باراندن بەئیشارەت پێی دەگۆت ئەو جارەی عەفوم بکە هەتا هەتایە تۆ بە ئەمن نۆکەری توومە، هەتا ماوەکی ئەو هابوو پاشان زگی پێسووتا چاکی کردەوە وەکو جاران، جەرگەکەی لێ ستاندنەوەو ئەشیاکانی دیشی لێ ستاندنەوە خیوەتێ لبادی هەرداوەو خانمی بردەبن خیوەتێ لبادو دەست کرا بەشایی و

زەمـــاوەند لەوێ بوو بە پاشـــا- پاش مـــاوەكی فكری لەبراو دایک و باوكی كردەوەو گۆتی خانم نەچین سەرەكی لە داكو بابم بدەین گۆتی كەیفی خۆتە بەڵام پێـدەزانی گـۆتی ناوە ڵلا بەڵام دارعـە سـایەكـە دەمـانبـات... رۆژەكـیـان لەسەربانی قەسرێ سواری دارعە سای بوون گۆتی (بسم الله الرحمن الرحیم) خـودایە لەنیـەتی بمگەینیـە كن داكم و بابم كـەچاوی هەر هێنادیتی لە شـارەكی لەسەربانی كەونە خانیە كیان دانایە تاریک و تاریكستان تەنها تر و سكایەک لە ژۆرێ دیارەكە چوونە ژوورێ دیتیـان پیرەژن و پیرەمێرد لە نزیكی ئاگری لێ كەتینە سەلامیـان لێكردن كە حاجی دەنگی كـوڕێ خۆی بیست چاوی كەمەک كراوە چونكە هەر دوكیان كۆرە ببون گۆتی توخوا ئەتو كامە كوڕی (سەعد)یان (سەعدونی)؟ گۆتی بابەمن (سەعدونم) ئامێزی بۆ گرتەوەدو گرتیە باوەش، تێر تێر مـاچی كردو بۆنی كرد دایكیشی هەروا (سەعـدون) گـۆتی بابە پێویسـتە لێـرە بڕوێن، گـۆتی كـوڕم بۆ كـوێ؟ گـۆتی با بەدەڕۆین (سـەعـدیش) دەبینینەوە ئینجـادە چینە لای من لە فـلان مـەملەكـەتی پاشـام، ئەوەش خـێـزانمەو كـچی پاشایە (سەعدون) هەمووی هەڵگرتن و سواری دارعە ساكەی بوون گۆتی لە نیەتێ بمانگەینەلای (سەعدی) برام لەسەربانی قـەسرێک لە شارێک دابەزین كـە نۆبـەتداران دیتـیـان لە ئـاسـمـان دابەزینە سەركـۆشكی پاشـا گـرتنیـان، قۆڵبەسیـتـان كردن بردیاننە بەردەمی پاشای (سەعـدی)، كە داكو بابی لەگەڵ برای دیتن یەكسـەر ئەمری كـرد بیـانكەنەوە كە كـردیاننە وەكـەوتنە راموسـانی یەكتر هەموو لایک بەڵام كچەكەی نا ناسی (سەعدون) گۆتی برام ئەوە براژنتە و خێـزانی منە كـچی فـلان پاشایە و ئەمنیش لەوێ بومە پاشـای شـاری ئەوان ماوەیەک لەوێ رایانبوارد ئینجا (سەعدی) كەبرا گەورە بوو جوی بەبیر هاتەوە، بەسـەرهاتی لەگـەڵ داكی... رۆژەک بە (سـەعـدونی) و باوكی گـۆت بـابە پێویستە بچینە شارەكەی خۆمان بزانین ئەو جوەی برادەرمان چی بەسەرهاتیە؟ شـاروەزعی چۆنە؟ دایكی گۆتی كـوڕم پێـویست نـاكـات ئێـمـە لەو شـاری هیچ نەبووین لێـرە بە پاشـایەتی دەژین (سـەعـد) گـۆتی هەردەچین رۆژەک سـواری داردەستـەكـەی سلێـمـان بو نووچوونە شـارەكـەی خـۆیان كـە لەبازار دەڕۆیشتن چوونە لای دوكـانـی جوی دیـتـیـان جـوو دانـیـشـتـووە ئـیـوارە چوونە لای پاشـاو هەمـوو مـاجـەرایان بۆ گـێـرایەوە بەیانی پاشا جـووی هێناو لە مەیدانێ شـاری لەسـێـدارەی داو ئەوانیش داكی خـۆیان هێناو وەكـو جـوی لە مـەیدانێ لە

سێدارەیاندا، پاش ماوەکی دوعا خوازیان لە پاشای کرد و سواری دار دەستەکەی بوون گەڕانەوە لای ماری (سەعدی) لەوێش (سەعدون) وژنی گەڕانەوە مەملەکەتی خۆیان هەریەک لەلایەک بوو بە پاشا کلاوە کەشی بە دیاری دابە (سەعدی) برای هەمبانە کەشی دا پاشای شاری خۆیان بەدیاری دار دەستە کەشی بۆ خۆی مایەوە بابیشیان هەر ماوەک لەلای (سەعدی) و ماوەکی دی لەلای (سەعدونی) بوو تا ژیانی مابوو منیش هاتمەوە لە و سەری کارەشم دڕاوچم پێنە برا...

*** ئەم هەقایەتەم لە سالی ١٩٨٣ لە (خالە کاکۆلی فریزی) وەرگرتیە کە ئێستا لە ژیان نەماوە.**

هەبوو نەبوو پاشایەک هەبوو تەنها تاقە کوڕەکی هەبوو ناوی (ئەحمەد) بوو، ئەحمەد حەزی لە کچە هەژارەکی دەکرد لەو شارەی، پاشاش دەیەویست ئامۆزای خۆی لۆ بهێنێ و کوڕەش رازی نەبوو زۆر بە باوکی وت بابە لێگەڕێ با ژن بەدلێ خۆم بێنم. بابی گوتی دەبی تەنها کچی مامی خۆت بینی... کوڕەکە تووڕە بوو لە باوکی لەسەر ئەو وەزعە باوکی دوا جار پێگوت ئەگەر ئەو کچە هەژارە بینی و کچی مامی خۆت نەینی لەو شارەدەرت دەکەم کوڕەکە گوتی بابە مادام لەسەر کچی مامم دەرم دەکەی من نەکچی مامم دەینم نەکچە هەژار من خواحافیز یەکیانم ناوێ بابی گوتی برۆ مادام پیاو نەبی لە مەملەمەتی من دامەنیشە... کوڕەکە ناوی خوای لێهێنا و سواری وڵاخی بوو بەتاقە سوارە لە شار چوە دەر... کەوتە چۆل و بیابانێک تا چەند رۆژەکی رۆیشت نزیکی شارەکی بوو دیتی شوانەک لەوێ مەڕی دە لەوە رێنی... چوە لای مام شوانی گوتی مام شوان وەرە جلوبەرگێ خۆت بدە من منیش جلوبەرگی خۆت دەدەمێ، شوان گوتی پاشا زادە عەیبە قەشمەری بە جلوبەرگی من مەکە لە هەموو دەورو زەمانان هەژار هەر هەبووە، ئەحمەد گوتی مام شوان بەخوای قەشمەریت پێناکەم من بەوتەدارەکە بچمە ناو شار تووشی بەڵادەبم... شوان گوتی باشە چوو لە پشت بەردەکی گەورە جلو بەرگی لەبەر کردن و لۆ ئەحمەدی فڕێدان ئەحمەدیش جلوبەرگی خۆی دایە شوانی...(ئەحمەد) جلی شوانی لەبەر کرد ئەسپی بەحری بوو دوومووی لە نێو چاوانی دەرێناو بەرە لای کردو رۆیشتەوە ناو ئاو ئەحمەدیش بەجلی شوانی بەرەو شارکەوتەرێ چووە بە ردەرگای دیوە خانەی پاشاو داوای کرد کارەک نییە لێرە بیکەم لێرەش دابنیشم، سەردەستەی خورامان گوتی کاکە بەتەنها قازەوانی هەیە گوتی قەیدی ناکا، ئەحمەد بەیانیان قازی دەبردنە ناو چوار باغی ئێواران دەیگەڕاندنەوە ماری ماوەیەک وارایبوارد بەقازەوانی رۆژەک لە ناو چوار باغی زۆر غەمبار بوو زۆر دلێ بەخۆی سوتا بەخۆی و بەوجلە پیسانەی دوومووی ئەسپی خۆی زوراندەوە ئەسپ یەکسەر لەپێشی ئامادە بوو بەتیرو شیرورم و گورز دەستە جلەکی زیادەی لە

پاشکۆی زینی قایم کرد بوو که کردیەوەو لەبەری کردو سواری ئەسپی خۆی بوو یەک دوو سەر لە ناو ئەو چوار باغە هات و چوو پالەوانەکی تەواو کچی بچوکی پاشای لە پەنجەرەی قەسری خۆی ئاگاداری وەزعەکە بوو کە دیتی قازەوان ئەو کورە لاوەیە یەکسەرتیری عەشقی لە جگەریدا... پاش ماوەیەک قازەوان دوومو‌ی لە نێو چاوانی ئەسپەکە دەر هێناو شاپەکی لە ئەسپیدا رۆیی و جلی قازەوانی لەبەر کردەوە کچە کەش ئاگاداری هەموو حەرەکاتی بوو ئەویش ئێوارە قازی هێنانەوە مارێ یەک دوو رۆژی پێچووکچێ گچکەی پاشا کە ئەحمەدی دیبوو بە خوشکەکانی تری گوت کە دوو خوشکی لە خۆی گەورەتری هەبوو... باشە بابم لۆ ئەمە بەمێردنادا خوشکی گەورە ئەوە پیر بووە ئەوی ناوەنجی ئەوە لە ماوەی خۆی تێپەڕی منیش ئەوە هەرەتمە، خوشکان گوتیان خوشکێ خۆ بەخۆ ناچین بەپاشای برێین بە مێردماندا لۆ ئەو شعوری نییە ئێمە واپیر بوینە گوتی خوشکینە ئەمن تەگبیرەکم هەیە گۆتیان دەی گۆنی سینیەک دێنین سێ گندۆرەی لەسەر دادەنێین یەک زۆر گەیی یەک کەمتر ئەوی سێیەم تازە دەگاو ناگا دەێنێرینە مەجلیسی پاشا، پاشا تێدەگا لە مەقسودی ئێمە، گۆتیان فکرەکی باشە، شتەکەیان ئامادە کردو بەکارە کەرەک ناردیانە دیوەخانی بابیان... پاشا گۆتی بابزانین دیاری کچەکان چییە؟ کەدەستەسرپیان لەسەر سنییەکە لابرد دیتیان سێ گندۆرەی لەسەرە یەکەک زۆر گەییە یەکەک کەمتر گەییە یەکیش تازە دەگا... گۆتی کچەکانم دیارە گندۆرەیان بۆ پاشا ناردیە چەقۆم بۆ بێنن بابزانین تامیان چییە؟ پاشا وەزیرەکی ئاقلی هەبوو گۆتی پاشا ئەوانە بۆ خواردن نین! ئەوە مانای خۆیان هەیە... پاشا گۆتی وەزیر مانایچییە؟ گۆتی پاشام خۆش بی گندۆرەی زۆر گەیی ئەوە کچی گەورەتە، ئەوەی تر کچی ناوەنجیە، ئەوەی تازە دەگات ئەوە کچی بچووکتە، ئەوانە شوکردنیان دەوێ و شەرم دەکەن لە حزوری جەنابت دەری ببرن بۆیە بەوشێوەیە دەریان بریوە پاشا گۆتی قەیدی چییە؟ بەیانی جاڕ بدەن لە ناوشار کەس نە چتە دەرەوە شوان و گاوانیش نابێ مێگەل دەر بکەن لە ناوشار بانگ رابێرن بەیانی پاشا کچەکانی بەمێرد دەدا کەس لە شار ناچتە دەرەوە... بەیانی کورسی و مێز رێز کران گەورە پیاوانی شار لە سەری دانیشتن وەزیران و پاشاش لە لایەک دانیشتن. پاشا داوای کچی گەورەی کرد گۆتی کچم ئەو سێوە بگرە ئەوەش هەموو خەلکی شار ئەو سێوەی لەدەستتە لە هەر کەسێک بدەی ئەوە شووبەو دەکەی... کچی گەورە گۆتی فەرمانتە بابە، کچی گەورە

سێوەکەی وەرگرت گەڕا سوڕا تاکوڕی قازی شاری دۆزیەوە سێوەکی لە پشتی داو ئەویان بە هەلهەلەو چەپڵە ڕێزان بردەوە ماڵێ قازی، ئەوجارە بانگی کچی ناوەندیان کرد سێویان دایە دەست ئەویش چوولە کوڕی وەزیریدا ئەویشییان بە هەڵهەلە بردەوە ماڵێ وەزیری ماوە کچی بچووک ئەویش سێوی وەرگرت گەڕا سوڕا تا لەبن دیوارەکی قازەوانی دیتەوە سێوەکی لە تەنگەیدا، وەخت بوروحی دەربچێ ئەوانەی لە تەنیشت قازەوانی بوون جنێویان دایێ گۆتیان لۆ ئێمەی هاویشتیە وەتو کەتیە، قازەوانیان لەوێ دەر کرد کچەیان بانگ کردەوە، گۆتیان غەلەتی کردیە دەبێ دوو بارە بکاتەوە. کچی گچکە دوو بارە سێوی وەرگرتەوە گەڕا تالە دووری خەڵکی، قازەوانی دیتەوە سێوەکی دی لێدا پاشا گۆتی بابە بیدەنە قازەوانی،بەڵام من لە شاری دەردەکەم بەخۆو بە مێردی مادام کچی منەو قازەوانی هەڵبژاردیە کچەش زۆر لەبابی پاڕاوە گۆتی بابە دەرم مەکە من لە جێی قازان شوێنەکی لۆ خۆم و مێردم ڕێکدەخەم باوکی ڕازی بوو غورفەکیان ڕێکخست، قازەوان گۆتی ئەتو لۆنە چووی یەکەکی لە پیاوە ماقولەکانی شار لۆ خۆت هەڵبژێری چ کارت لەسەر منی هەژار وقازەوان هەبوو گۆتی بابم ئێمەی سەربەست کردیە مێرد بە کەیفی خۆمان بکەین کێ هەڵبژێرین منیش ئەتوم هەڵبژارد بە فەقیری بە هەژاری لەگەڵت دەژیم... گۆتی باشە...
ماوەکی لەگەڵ یەکبوون داکی بە دزی پاشای شتی دە دانێ خوشکان بەدزی شتیان بۆ دەنارد ئیدارەیان پێدەگرد... ماوەک پێچوو گۆتیان پاشا گوڕی بووە، تەبیب و حەکیمی شاری لێ کۆبوونەوە گۆتیان گۆشتی مامزی دەرمانە، پاشا گۆتی گۆشتی مامزبەکێ پەیدا دەبێ؟ وەزیرەکان گۆتیان پاشامان خۆشبی بەجووتە زاوا یەکەت کوڕی قازی و کوڕی وەزیری لۆ پاشا کەس هەیە لە مەملەکەتی لەوان پاڵەوانتر؟ بانگیان بکەو بیانێرە ئەوان دەتوانن بۆت پەیدا بکەن... بانگی کوڕی قازی و کوڕی وەزیریان کرد زاوایانی پاشای... پاشا گۆتی کوڕەکانم دەردی من وا دەزانن تەبیبیش گۆشتی مامزیان دەرمان بۆم دانایە دەبێ بۆم پەیدا بکەن... گۆتیان مامە بە چاوان هەریەکەی سواری ئەسپی خۆی بوو لە شار چوونەدەر، قازەوانیش گۆتی ژنێ ئەتۆش بەبابت بڵێ قازە وانیش دەیەوێ بچێ ئەگەر ئەسپەک و هەندەک ئەسبابی بدەنێ ئەویش چوو ولاخەکی وەرگرت بەردو ماڵ ڕۆیشت قازەوان سوار بوو هەر چۆنەک بوو خۆی گەیاندە دەرێی شار، لەوێ چوار پەلی ولاخەکەی بەست، دوومووی ئەسپی بەحری زووراندەوە ئەسپ بەشیرو تیرو مەتارو جل و بەرگی پاشایانە لەوێ

ئامادە بوو... قازەوان جلی لەبەر کردن نقابی خستە سەردەمووچاوی سواری ئەسپی بەحری بوو ماوەیەکی ڕۆیشت گەیشتە دەشتو بیابانێ لەوێ ڕەوە مامزەکی دیتەوە تیرەکی لەیەکەکی داو غاریدا سەری کوشتیەوە بە پاشکۆی زینیوە کرد گەڕاوە لە ڕێگادیتی واکوڕی قازی و کوڕێ وەزیری خەریکی کیسەڵن بیگرن کەدەستی بۆ دەبەن کیسەل وششەی دێوسەری دەباتەوە ناو کیفی ئەوانیش رادە پەڕن ناوێرن بیگرن دیسان دەگەڕینەوە سەری... ئەویش گۆتی سەلامو عەلەیکم... جوابی سەلامیان داوە بەخێر بێی کاکە... گۆتی ئەوە خەریکی چنە؟ گۆتیان کاکە پاشامان گوڕوو بووە خەریکێن گۆشتی مامزی لۆ دەبەین ئەویش چەند خەریکێن پێمان ناگیرێ، قازەوان قاقاپێکەنی گۆتی کاکە ئەوە کیسە لە مامز نییە سەرە رمەکی گەیاندە کیسە لی و بلندی کرد گۆتی کاکە ئەوە مامزە من راوم کردیە کە سەیریان کرد زۆر جوان بوو قەت شتی وایان نەدیتبوو گۆتیان کاکە ئەتو دەچیەکام ولاتی؟ گۆتی کاکە من کوڕی پاشای رۆژ هەلاتم دەچمە مەغربستانێ گۆتیان ئەدی ئەو مامزە چ لێ دەکەی؟ نایفرۆشی گۆتی نەء !.. پاشان گۆتی کاکە من بەپارە نادەم گۆتیان ئەدی بەچی دەدەی؟ گۆتی بەمۆر هەریەکەو مۆرتان بەو ئەنگوستیلەی دەستم لە قوونی دەدەم مامزەکەتان دەدەمێ.. هەردووک گۆتیان قسەی بێمانا نەکەی ئەگەرنا لێرە دەتکوژین. گۆتی کاکە خۆتان عادزمەکەن من نایفرۆشم بەدوعا، کەمەک رۆیی کوڕی قازی گۆتیە کوڕێ وەزیری بالێی بکڕین ئەوە جارەکی دی لە کوێ ئەمە دەبینیتەوە ئەوە دەڕواتە مەغربستان بۆ ئێمەش سەر بلندیە مامز بۆ پاشای ببەینەوە، گۆتی یاللا، بانگیان کرد کاکە ڕاوەستە گۆتی ها کاکە گۆتیان وەرە لێتدەکڕین- قازەوان گەڕاوە پووش و پەلاشیان کۆکردەوەو ئەنگوستیلەی پەنجەی گەرم کرد هەریەکە و مۆری ئەنگوستیلەی خۆی بەقوونیانەوەنان، کەلەشەکەی داپێیان و گۆتی، بەلام جەرگو هەناوەکە نادەم جەرگ و هەناوەکەی دەرهێناو گۆتی لەنیەتی تامەکە بێتە جەرگ و هەناوەکان. خواحافیزیان لەیەک کرد ئەوان گەڕانەوە خەلکی شار هەموو لەسەربانان واچاوەڕوانە، کە جووتە شێری زاوای پاشا گەڕانەوە کەلەشی مامزیان بە پاشکۆی زینەوە کردیە خەلک بە چەپلە ڕێزان گولبارانیان کردن لەسەربانان کەگەیشتنە بەردەرکی دیوەخانێ پێشوازیان لێکردن کەلەشی مامزیان دابەزاند قازەوانیش لەولای سوڕاوە هاتەوە لای پیرە ئەسپەکە جلوبەرگی لەبەر داکەندن و جلی قازەوانی لەبەر کرد، ئەسپە شڕەی هەستاندەوە ئەسپی خۆی ئێزندا،

سواری قۆڕە ئەسپەکەی بووەوە، هەتا ئێواری گەیشتەوە ماریێ. گۆتیە ژنەکەی لەڕێ توشی کوڕی قازی و وەزیری بووم مامزیان پێبووجەرگ و هەناویان دامن ئەتۆش لێیانێ و پاروەکی لۆ پاشای بیە، ئەوانیش لەوێ گۆشت مامزیان لێناو لۆ پاشایان هینا پێی خراپتر بوو کەژنی قازەوانی قاپەکی لۆ پاشای برد گۆتی بابە ها پاروەکیش لەوەی بخۆ گۆتی لە کوێت هیناوە؟ گۆتی کوڕی قازی و کوڕی وەزیری لەڕێ هەندەکیان دایتە قازەوانی کە پاشا پاروەکی خوارد یەکسەر فەرقی کرد، لەگەڵ گۆشتەکەی دا زۆر تامی جیاوازبوو قاپەکەی هەموو خوارد پاشا چاک بووەوە، بۆ ماوەیەکی تر پاشا کەچەڵ بوو تەبیب و دختۆری خڕکردنەوە گۆتیان گۆشتی بزنە کێویەکی سێ ساڵی دەرمانە، گۆتیان ئەو جارە بە کێ پەیدادەبێ گۆتیان پاشا کەس هەیە لە جووتە شێری زاوات زیاتر ئەگەر لە قوللەی قافیش بێ ئەوان پەیدای دەکەن. بانگیان کردن پاشا گۆتی کوڕم دەردی من دەزانن دەختۆریش دەڵێن گۆشتی حەیوانە کێویەکی سێ ساڵی دەرمانە بە ئێوەش نەبێ بەکەس نایێ دەبێ لۆم پەیدا بکەن... گۆتیان بەسەرچاو مامە، بەجووتە سوارە دیسان لە شار چوونە دەر. قازەوانیش هەروەک جاری پێشی ئەسپە لەڕەیان بۆ برد گەیشتە دەرێی شاری دوو مووی ئەسپێ خۆی زووراندەوە ئەسپ ئامادەبوو جلی لەبەر کردن دەستی دایە شیروتیر بەرەو چیایان ملی ڕێی گرت دەیزانی کێوی بەس لە چیایان هەیە. گەیشتە چیایەک لەبن ڕەوەزەک لێی دانیشت کە بەیانی دادیتی ڕەوە کێوییەک لە تەنیشتی ڕەت بوون تیرەکی لە حەیوانە کێو یەکی سێ ساڵی دا چونکە دەیزانی سێ سالی قوچی سێ لقی هەیە هەر ساڵە و لقەک گەیشتە سەری، سەری بڕی و بە شکۆی زینی ئەسپی خۆی هەڵواسی و گەڕایەوە لە ڕێ دیسان گەیشتە کوڕی قازی و کوڕی وەزیری دیتی، پەڕەسێلکەیان لەبن پردەکی کردیە ئەو لاو ئەو لایان لێکرتیە پێیان ناگیرێ سەلامی لێکردن کاکە ئەوە خەریکی چین؟ گۆتیان وەڵڵا کاکە پاشامان کەچەڵ بووە تەبیبان گۆتیان گۆشتی بزنە کێوی دەرمانە خەریکین پێمان ناگیری. ئەویش سەرە ڕمەکی گەیاندە پەڕەسێلکەو هینایە خوارێ گۆتی کاکە ئەوە تەیرە بەستەزمانە، کو بزنە کێویە؟ ئەوە بزنە کێویە، من کوشتیتم کەسەیریان کرد سەریان سوڕما هەندە جوان بوو گوتیان کاکە نایفرۆشی ئەویش گۆتی بەپارەنا گۆتیان ئەدی؟ گۆتی بەمۆر دەیفرۆشم من هەرشتەک بفرۆشم بەو ئەنگوستیلەی دەستم مۆری دەکەم هەرێکە و مۆرتان بە قوونیەوە دەنێم، دەتاندەنێ، یەکەمجار خۆیان زویر کرد، پاشان

گـۆتیـان تۆ خـەڵکی کـوێندەری گـۆتی من کـوڕی پاشـای رۆمم دەچمـە فەرەنگستانێ، کوڕی قازی گۆتیە کوڕی وەزیری وەک جارەکەیدی لێی دەکڕین ئەویش دەڕواتە رێگای خۆی... گۆتیان کاکە ڕازین، دارو پووشیان کۆ کردەوە ئەنگوستیلەی گەرم کردیەکەو مۆری لە قوونی دان وەک جاری پێشووجەرگو ناوی دەرهێنان گـۆتی لەنیـەتێ تامی بێـتـە جـەرگـو هەناوان... قـازەوان خواحافیزی کردو رۆیشت ئەوانیش گەڕانەوە بەرەو شار، کەلەشی بزنە کێوی سێ ساڵیان بەزینی وڵاخی لە پشتەوە هەڵواسیبوو خەڵکی شار بە وردودرشت هاتبوونە تەماشای جووتە شێرەکەی پاشای... گەیشتنە بەردەرکەی دیوخانێ کە لەشیان دابەزاند بردیان لێیاننا... قازەوانیش بەدەستوری جاری پێشوو گەیشتە جێگای خۆی، ئەسپی خۆی ڕەوان کرد سواری قۆڕە ئەسپی بووەوە بەشە لەشەل گەیشـتـە مـالێ، بەژنی گۆت ئەو جەرگو ناوەی لێنی ئەوە لەرێی کوڕی قـازیو کـوڕی وەزیری لە رێگای دایانە من پارووەکـیش لۆ بابت ببـە.. ژنەش دەیزانی مـەسـەلە چیـیـە! جەر گوناوی لێناو قـاپەکی بۆ بابی بردپێش ئەوان گۆشتی کە لەشەکەی خوارد بوو وەزعـی زۆر خراپتر بوو کەجەرگو ناوی خوارد پاشا یەکسـەر فـەرقی کـرد قـاپەکەی هەمـوو خـوارد پاشا ئەو جـارەش چاک بووەوە... مـاوەیەکی تری پێـچـوو پاشا پیـسـک بوو تەبیب کۆبـونەوە هەریەک دەرمانەکی لۆدیار دەکرد دختۆرەکی زۆرزان هەبوو کە تەماشای کرد گۆتی پاشا (شیرێ شێران، لەمەشکەی شێران، شێرببینی، شێرلێبخوری) هەمـوو لە شێری بێت ئەوە دەرمـانی تۆ یەوچاک دەبیـەوە... گـۆتیـان ئەوە بەکێ پەیدا دەبی؟ گۆتیان پاشا کەس هەیە لە کوڕی قازی و کوڕی وەزیری زاوای جەنابتان زیاتر؟ پاشا لەدوای ناردن پێیانی گۆت کوڕەکانم دووجار نەجاتم بووە بەدەستی ئێوە ئەو جـارەش چارەم بەدەسـتی ئێوەیە گۆتیـان پاشـا حازرین هەرچی بفەرمووی گۆتی کوڕەکانم تەبیب دەرێن شیرێ شێری دەرمـانە و چاک دەبیەوە. گۆتیـان بەسـەرچاو بە جـۆتە سـوارە لە شـاری وە دەرکـەوتن قـازەوانیـش ژنی نارد قـۆڕە ئەسـپی بۆ هێنـاو سـواری بوو گـەیـشـتـە دەرێی شـاری دوومـووی ئەسـپی زووراندنەوە ئەسپی بەحری ئامادە بوو لە لای جلی گۆڕین شیرو تیری هەڵگرتن و رکـێبـەکی لە ئەسپی بەحریدا ناوی خـوای هینا حەفت شـەوو حەفت رۆژان رۆیی، گـەیشـتـە چیـایەکی کـانیـا وەکی لێـبـو لێی دابەزی، ئاوی خـواردەوە دورکـات نوێژی کـرد، دیتی پیـرە مـێـردەک لێی پەیدابوو سەلاوی کـردو گـۆتی کورم ئەحـمـەد ماندی نەبی ئەحـمـەدیش وەڵامی داوە گۆتی بۆ کـوێ؟ گۆتی کو

زانیت ناوم ئەحـمـەدە ئەوهەش دەزانی دەچمە کـوێ؟ گـوتی کـوڕم ئەحـمـەد سەفەرت زۆر سەختـە بەس بەتەمای خودای وەرە ڕێت بۆدانێم... لەپشت ئەو چیایەی دوکانیاو هەیە یەکەکیان شیرینە یەکەکیان تاڵە دەچییە ئەوێ کانییە شیرینەکە داپۆشە زۆر بەجوانی کانیە تارەکە دەمێنێ لە نزیک کانیە تارەکە قۆرتەک لێدەو خۆت بشارەوە... کەدە قـەمیشـەکی زۆر درێژ بکە لای خۆت داینێ شێرەک دێت حەفت سارە پێی ئاو سایە وەک فەردەیەک لەدوای دەڕوات کـە دەگـاتە سـەر ئاوەکـە هەفـتـەی جـارەک دێ ئاو دەخـواتەوە دەڕوا دەچـتـە سەرکانیە شیرنەکە کە دەبینی داپۆ شرایەونە مایە دێتە سەرکانیە تارەکەسەر بە ئاو یوە دەنێ هەتا دەکەوی دەخواتە وەکە کەوت لێی وەرە دەرێ قامیشە تیژەکە هەڵگرە هەتا قوەتت هەیە قامیشەکی لە پێیە ئاوساوەکەی بدە، خێن وپیسایی بە گۆڕێ وەر دەبی کەبەخەبەردێ بانگ دەکا کێ وای لە من کرد هەتا هێسکو پیستی بهاڕم سێ جار بانگدەکا وەڵام مەدەوە کەماوەکی پێچوو ژانی پێی نامینێ چاک دەبیتەوە ئینجا بانگدەکا کێ بوو چاکەکی وای لەگەرە من کرد هەتا بەماری دنیاییێ خەنی بکەم سێ جار بانگدەکا جاری سییێەم وەرە دەرێ پیێ بلێ ئەگـەر قـەبوولـکەی من بووم... پێت دەرێ بخـوازە مـاری دنیـایێ ئینجـا داخـوازیەکـەی خـۆی پێ بلێ ئەگـەر ئەو چارەت نەکـا بەکـەس چارە ناکرێی... ئەمەی وت و لەپێش چاوی ئەحمەدی پێرە مێرد ونبوو... ئەویش هەرستا سواری ئەسپی بوو ناوی خوای لێهـێناو رۆیشت گەیشـتـە چیایەکەو سـەر ئاوەکـان چۆن ڕێی لۆ دانرا بوو وای کـرد. شـێـر هات ئاوی شـیـرین نەبوو ئاوی تاری خـواردەوە کەوتە گۆڕێ ئەحـمەد ناوی خوای هیناو قـەمیشـەکی لە پێیە هەڵاو سایەکەی دا کێم و خێن بە گۆڕێوەر بوو کەشێر بەخەبەر هات لەبەر ژانی پیێ هاواری کرد سێ جاران کێبووای لەمن کرد هەتا هێسکو پیستی بهارم... کـەس نەبوو پاش مـاوەیەک چاک بوەوە ژانی شکا گـوتی کـێـبـو ئەو چاکەی لەگەرە من کرد هەتا بەماری دونیا خەنی بکەم؟ جاری سێیەم ئەحمەد هاتە دەرێ گوتی گەورەم من بووم.گوتی بخـوازە مـاری دونیـایێ چیت دەوێ لە دنیـا بۆت بکەم... گوتی گەورەم تەنهـا خۆشی تۆم دەوێ جاری دووەم هەروای گوت سێیـەم جـار گوتی گەورەم دەمـەوێ (شـیرێ شێران، لەمـەشکێ شێران، شێربینی، شێر لێبخوری) گوتی ئاخ بریا حەفت ساربدی پێم هەروابا، بەس ئەودە عـوایەت لێ نەکـردبام، بەڵام چارەم نییـە وەرە ئەتو ناوت چییـە؟ گـوتی ناوم ئەحمەدە شێر گوتی ئەحمەد برۆ لەپشت ئەو گردەی حەفت فەرخەم لەوێنە،

یەکی بگرەو سەری ببڕە بەس ئەحمەد بەخۆت دەزانی ڕەحمی داناپەنی
کوەزریکەی بگاتە من پەل پەلت دەکەم گۆتی باشە شێر گۆتی پاشان کەوری
بکەو پیستەکەی لۆ من بینە ئەحمەد چوو دیتی فەرخەی وایاری دەکەن ئەحمەد
پاڵەوانەو بەقودتە فەرخەکی گرت و خنکاندی کەوری کرد پیستەکەی بردە لای
شێری شێر پڕی شیری خۆیکرد زریکەیەکی کرد شێر ئامادە بوون گۆتی ئەحمەد
ئەو شیرە لە پشتی شێرەکی قایم بکە ئەحمەد شیرەکەی لە پشتی شێرەکی قایم
کرد کە شێرەکی سەرۆکی شێران بوو بە شێرەکی گۆت برۆ ئەو بارە لێبخوڕە
ئەحمەد تۆش لەگەریان برۆ بەس ئەحمەد کە باردکەت گەیاندە جێ ئەو شێرانە
دەگەڕێنیەوە دەرێی شاری نەکەن ئازاریان بدەن... ئەحمەد دەستی شێری
ماچکرد ڕۆیشت سێ شێر بەرێوە لەگەڵ ئەحمەدی کەهاتن لەرێ گەیشتنە کوری
قازی و کوڕی وەزیری دیتیان واخەریکن تورە گەیان پێیە ماکەرەکی دە دۆشن
گۆتی هابرادران ئەوە خەریکی چینە؟ گۆتیان وەڵلا پاشامان پیسک بووە ئەود
شیری شێری لۆ دەبەین ئەویش لێ ناگەڕێ بیدۆشین... گۆتی هەی بێعە قلبنە
ئەوە ماکەرە شیری شێران ئەوە لای منە... ئەوەش مەشکەی شێری شیری
تێدایە ئەوەش شێرە رایدەکێشی ئەودش شێرە لێیدە خوری گوتیان نایفرۆشی
گۆتی نابە پارە بەهەموو ماری دونیای نادەم گۆتیان ئەدی بەچی دەدەی؟ گۆتی
بەمۆر دەتاندەمێ... ئەوەل جارەک جاران خۆیان زویر کرد پاشان کوڕی قازی
گۆتیە کوری وەزیری ئەو جاردش سایلی جاران لەکێ ئەمە دەناسیتەوە دایان
بەزاندو رازی بوون پووشیان خڕ کردەوە ئەنگوستیلەی لە ناو نایەکو مۆری بە
قوونێ وەنان... ئەوە یەکێ سێ مۆر- بەس شەرتەکم هەیە ئەمن لێرە
چاوەڕوانم کە گەیشتنە جێ یەکسەر باردکە دابەزێنن شێرەکانم لۆ بێتەوە- ئێرە
ئەگەر نا شێر مەملەکەت و کاول دەکەن. ئەمنیش هەرودها گۆتیان فەرمانتە...
ڕۆیشتن کە گەیشتنە نزیکی شاری لە نەڕە نەڕی شێران خەڵک وەخت بووشێت
ببی لەترسان لە پەنجەران تەماشایان دەکرد ناو ێران بێنە دەرێ ئەوانیش
بەجووتە سواردو سێ شێر گەیشتنە ناو شاری بەرەو دیوەخانێ پاشای
سەرکەوتن کە وەزیرو پاشا سەیریان کرد ئەوە شار هەمووی هاتیتە دیار ئەو
شێرانە ئافەرینیان لێکردن... ئەوانیش شیرەکەیان دابەزاندو شێرە کانیان لۆ
کابرای بردنەوە دەرێی شاری... ئەحمەد چاوە ڕوانی دەکردن لەوێ ئەحمەد
سوپاسی شێرەکانی کردو ناردنیەوە... بەخۆشی هاتە لای قۆرە ئەسپی قیتی
کردەوە سوار بوو. بەشەل شەل گەڕاوە ماری خۆیان پاشاش چاکبووەوە ماوەک

بەسەرچوو لە شکرەک هاتە سەرماری پاشا گۆتی یادەبی خەرجیەی دەسالێ
بدەن یان شارو لێ و ێران دەکەین. پاشا وەزیرو گەورە پیاوی کۆ کردنەوە پاشا
پرسی پێکردن کوڕی قازی و کوڕی وەزیری گۆتیان پاشا ئەمە شەڕ دەکەین
خەرجیەو باج نادەینە کەس پاشا گۆتی باشە... بەیانی قاسیدیان ناردبۆ لە
شکرەکە گۆتی پێیان برێ حەدو وجودیان نەبی ئەمە باجی نادەینە کەس هەر
قوەتەکی هەیتیان با بەکاری بینن... بەیانی لە هەردو لا بووە شەڕ لە شکرەکە
هاتە پێش کوڕی قازی و کوڕی وەزیری خۆیان لەبن بەردەکی نابو وەک بی ناو
ئاو دەلەرزین. قازەوانیش [illegible] حاران چووە دەرێی شاری دوومووی ئەسپی
زوو‌راندەوە ئەسپ بەتەدارەکی شەڕی ئامادە بوو ئەسبابی شەڕی هەلگرت
نقابی خستە سەردەمو چاوی لەلایەکی لەشکری دوژمنیدا هەرچی کەوتە
بەردەستانی کوشتی ئەوانی دی هەڵاتن بۆ ئێوارێ لایەکی لەشکری چۆ
لکرد... ئێوارێ نەهاتەوە بۆ رۆژی دوودم هەروا بۆ رۆژی سێیەم لەشکری
شکاندو راوینان... لەوسەری گەڕاوە بەهەموو تەدارەکەوە چوو بۆ مالێ
خۆی... پاشا چۆنیەتی شەڕەکەی پرسی گۆتیان پاشا نقاپۆشەک پەیدا بوو
کەوتە ناو لەشکری دوژمنی بە تەنها لەشکری شکاند گۆتی چی لێهات
گۆتیان مێوانی مالێ قازەوانیە- پاشا خەبەری لۆ نارد دێتە دیوەخانێ یامن
بێمە لای؟ گۆتی نامن دێمە خزمەتی پاشای... بە وتەدارەک و ئەسبابی شەڕو
ئەسپی بەحری بەرەو کۆشکی پاشا چوو پاشا گۆتی کوڕم زۆر مەمنونت دەبم کە
ئەو چاکەت لەگەڵە من کرد چۆن دەتوانم ئەو چاکەت بدەمەوە ئەمنت لە رەزیلی
و ژێر دەستی خەلاس کرد، لە دونیا چیت دەوێ بۆت جێبە جێ بکەم...
ئەحمەد گۆتی پاشام خۆشبی من پێویستیم بەمارو زێری تۆ نییە ئەمن کوڕی
پاشای یەمەنم دەرۆمە مەغریبستانێ، بەلام یەک داوام لە تۆ هەیە...! پاشا
گۆتی برێ بە چاوان گۆتی پاشا دوو کۆبلەم لای تۆ نە ئەگەر بمدەیەوە مەمنون
دەبم ئەگەر نا من خودا حافیز گۆتی کێنە دەیا بناسیەوە گۆتی بەرێ...
بانگکرا خەلکی شاری بە گەورەو بچووک هەموو هاتن گۆتی ئەوانە کەسیان
هەونیە پاشا گۆتی کێمایە؟ گۆتیان گەورەم بەس دوو زاوای تۆ کوڕی قازی و
کوڕی وەزیری گۆتی بابێن... هەر لە دوور قازەوان گۆتی پاشا ئەوانە
خۆیانن... پاشا سەری سوڕما گۆتی کوڕم ئەوانە زاوای منن کوڕی قازی و
کوڕی وەزیرینە... قازەوان گۆتی پاشام هەرکێن ئەوانە پیاوی منن... کە
گەیشتنە ئەوێ پاشا قسەکەی بۆ گێرانەوە خۆیان تورە کرد گۆتیان ئەگەر لە

دیوەخانێ پاشای ئەبای ئیستا بەو شمشێرەی سەرمان دەبڕی... گۆتی بابە خۆتان تورە مەکەن پیاوی من هەموو نیشانەیان هەیە پاشا گۆتی کورم نیشانەی تۆ چیە؟ گۆتی پیاوی من هەریەکی سێ مۆریان بەو ئەنگوستیلەی پەنجەم لە قوونیان دراوە ئەگەر وانە بوو من بەسزای خۆم رازیم... پاشا گۆتی یەڵلا قوونیان رووت کەن هەرچەند خۆیان هێناو برد رووتیان کردن کەسەیریان کرد وایە هەریەکەی سێ مۆریان بە قوونیەوەیە. گۆتی پاشا وایە گۆتی وایە کورم. ئەویش لە پێش چاوی ئەو خەڵکەی نقابی لەسەر سەری خۆی هەڵگرت گۆتی پاشام خۆشبی من قازەوانی زاوای تۆمە کوری تەڵانە پاشامە ناوم (ئەحمەد)د لە باوکم زۆر بریە هاتمە لای تۆ ئەو مامزەی لۆ تۆیان هێنا من بە مۆرەک پێم فرۆشتن لە رێی خەریکی کیسەڵ بوون بیگرن. ئەو کیویەی لۆ تۆیان هێنا ئەویشم بە مۆرەک پێفرۆشتن خەریکی پەرەسێلکە بوون دەیانگرت ئەو شیرەی شێران کە لۆیان هینای ئەویشم بە مۆرەک پێفرۆشتن ئەو لەشکرەش من شکاندم ئێستاش من ئامادەمە لێرە لۆ هەموو ئەمرو فەرمانەکت... پاشا گۆتی کورم لۆ زوو نەتگوت من کورە پاشامەو بۆیە قازەوان لای تۆ... بەلام کچی بچووکی من ئەو سرەی کوزانی؟ بانگی کچی گچکەیان کرد گۆتی بابە من لەناو چوار باغی دیتم ئەسپەک هاتە لای خۆی گۆری یەکدوسەر هاتو چوو ئەسپی بەرەڵلا کردەوەو جلی قازەوانی لەبەر کردەوە من بەوجۆرە زانیم کورە پاشایەو پاڵەوانە هەر ئەودەمە پاشا تاجی لەسەری خۆی دابەزاندو خستیە سەرسەری ئەحمەدی گۆتی من پیر بوی‌مە پاشایەتی هەر شایانی تۆیە ئەحمەد هاتەوە سەرکورسی پاشایەتی لەو ولاتەی لێیدانیشت ژیانەکی بە خۆشی بردەسەر چەند ئەولادی بوو... هەزار رەحمەت لە گوێرا دێران بی.

*** ئەم هەڤایەتەم لە زۆر کۆنەوە لە باوکم (عبد الرحمن قادر) گوێ لێبووە کە لە سالێ ۲۰۰۸ لە تەمەنی ۸۱ سالێ کۆچی دوایی کرد لە هەولێر.**



**نووسەر لە چەند دێڕێکدا:**

* لەساڵی ١٩٥٨ لە شەقڵاوە لە دایک بووە.
* خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شەقڵاوە تەواوکردووە.
* خانەی مامۆستایانی لە هەولێر تەواوکردووە لە ساڵانی ١٩٨٠ بەسەرەوە خەریکی نووسین و خوێندنەوەیە.
* دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (مەم)و (دەنگارە)بووە، کە لە شەقڵاوە دەردەچوون.
* لە چەندان رۆژنامەو گۆڤار بابەتی بڵاوکردۆتەوە دەربارەی کەلەپوورو فۆلکلۆرو رەخنەو بابەتی ئەدەبیو لێکۆڵینەوە.
* ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە.
* چەند بابەتی تری ئامادەیە بۆ چاپ.

## پێرست

حیکایەت یان چیرۆک.
یان گێڕانەوە لە دنیای
ئەدەبی فۆلکۆری کوردیدا
شوێنێکی دیارو شیاوی
هەیە بیرو لێکدانەوەی والآ
کردۆتەوە، سەربەری
تاقیکردنەوەو، لە دنیا
گەیشتن و شۆڕبوونەوە بۆ
ئەو شوێنە بزرانەی کە
نەستی مرۆڤ و کاری جوان
شیرازە دەکەنەوە. ئەو گەڕان
و شون هەڵگرتنەی
حەکایەتان بۆ چەندان
مەبەست بووە، لەوانە:
زمان، ئامۆژگاری، لە
قەدەغەدوان، نزیک بوونەوە
لە ئاقیدەی ڕابردوو، کە
ڕۆژگارێک بیری سەردەمیان
بووە، هەر حەکایەتێک
بەچەند قۆناغ و زەمانێک
داڕەت بووە تا گەیشتوەتە
ئێمە، ئەمڕۆکە بە
تۆمارکراوی دەیانخوێنینەوە.

**خالید جووتیار**

**چاپخانەی رۆشنبیری**

**٢٠٠٠ دینار**